یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
لە کوردستاندا

33

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی سێیەم شوباتی ٢٠١١

## پەیامت چییە لە ژیاندا؟

## دەوڵەمەندترین مرۆڤی سەدەی بیست و یەك!

## وەفایەکی درەنگ!!



## وەرزەکانی ژیان!

## دەی تۆش زەردەخەنەیەك بکە ...

## کەی دەبێت سەرۆك... داوای لێبوردن بکات؟

The first Magazin Especializined in Management and Human Development in Kurdistan

لە پێناو کەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی سێیەم - ژمارە 33 - شوباتی 2011



بەشی ڕیکلام

07480112787

دابەشکردن

کۆمپانیای پەیپەر

٠٧٧٠٨٦٤٩٢١٠

نرخ 2500 دینار



























ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری سلێمانی مۆڵ- نهۆمی دووەم

بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە

٣١٩٣٩٤٦ ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

E-mail: bryarmagazin@gmail.com

هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

# حەق زۆر قورسە،
# لەبەرئەوە هەڵگرانی
# زۆر کەمن

بولانۆ

# سەربەستی ناسنامەی ژیانو مرۆڤایەتی



سەرنووسەر

## یەکەم دڵۆپ

باوەڕناکەم لە دنیادا هیچ شتێك بتوانێت ناسنامەی ژیانو مرۆڤایەتی بێت، هێندەی(سەربەستی)، ئەو کاتەش مرۆڤ ناسنامەی (سەربەستی) لێ دەسەنرێتەوە، وەکو بوونەوەرێکی بێ مانا، بوونو نەبوونی چوونیەك دەبێت لەم وجوودەدا، بەڵکو نەبوونی زۆر ئاسوودەترە لە ژینی کۆیلەییو ژێردەستەیی!

ئەو کاتەی مرۆڤ سەربەستە خاوەنی هەموو شتێکە، ئەگەر لە گەنجینەی دنیاشدا قرۆشێك شك نەبات، ئەو کاتەش کە سەربەستی لە دەست دەدات خاوەنی هیچ نییە، گەر هەموو دنیاش موڵکی ئەو بێت، چونکە ئەو خاوەنی خودی خۆی نییە!

گەورەترین بەڵاش کە بەسەر مرۆڤەکاندا دێت، لەدەستدانی خودی خۆیانە، ئەو کاتە یە کە هەموو دەردەسەرییەکانی مرۆڤ دەست پێدەکات کە مرۆڤ خاوەنی هەڵوێستی خۆی نییە، ناتوانێت گوزارش لە هزرو بۆچوونی خۆی بکات، ناتوانێت ئەوە بکات کە دەیەوێت، یان ئەوە بڵێت کە ئارەزووی لێیەتی.

کەسانێکی تر لە بری ئەو بڕیار دەدەن، ئەمیش چەپڵەیان بۆ لێدەدات، لەبری ئەو کەسانێك: دەکڕن، دەفرۆشن، واژۆ دەکەن، ئەویش دەبێت باریکەڵلایان لێ بکات!

دەبێت ئەو بەرگە لەبەر بکات کە بۆی دووراوە!

ئەو خواردنە بخوات کە بۆی لێنراوە!

ئەو وتارە بخوێنێتەوە کە بۆی نووسراوە!

هەمیشە بڵێ (بەڵێ)!

ئەگەر ویستی جارێك لە جاران بڵێ (نەخێر) ئەوا پێش هەموو کەس گەرووی لەگەڵی بە شەڕ دێت!

چونکە بێ پرسی ئەو، لەسەر (بەڵێ) گۆشکراوە!

ناتوانێت بە ویستی خۆی پێبکەنێت!

پڕ بە گەرووی خۆی بگری!

ناتوانێت دەستبکات بە گیرفانیدا!

ناتوانێت ڕووبکاتە قیبلە!

لە سایەی ئەم سیستەمەدا مرۆڤە بێ ناسنامەکان، مرۆڤە بێ سەرو بێ زمانو بێ چاوو گوێچکەدارەکان، وەکو تۆپەڵە سفری پێش فاریزە هەموو دنیا داگیر دەکەن.

دەتوانن خانووی جوان، ماشێنی جوان، جلی جوان، دەستەبەر بکەن، بەڵام بێ ناسنامەن!!

لە پڕ مرۆڤەکان هۆشیان دێتەوە، مرۆڤەکان سەریان دەدۆزنەوە، چاویان دەبینێت، لەو ژیانە بێزار دەبن، دەبنەوە بە مرۆڤ، ڕازی نابن کۆیلەی کەسێکی وەکو خۆیان بن، ڕازی نابن چارەنووسیان، ئایندەیان، ئاواتەکانیان، پەیوەست بێت بە ئارەزووی کەسانێکی وەکو خۆیانەوە!!

ئەو کاتەی کە مرۆڤەکان ناسنامەی خۆیان دەدۆزنەوە، ئیتر لە پێناویدا ژیانو سەروەتو سامانیشیان دەبەخشن، چونکە بێ سەربەستیو ئازادی هیچ مانایەك بۆ ژیانیان بەدی ناکەن.

وشەی سەربەستیش، سیحرو جادووی گەلانە، بە بیستنی ئەم وشەیە، دنیا دەهەژێت، تاقی کیسراو تاجی فیرعەونو هێزی ئەسکەندەر دێنە لەرزە!!

چونکە لە ژێر سرودی سەربەستیدا مرۆڤەکان دەبنەوە بە مرۆڤ، چاویان هەموو ڕەنگەکان وەکو خۆی دەبینێت، زمانیان بە ئازادی سرودی ژیان دەچڕێت و ئیتر چیدی بولبولەکان ئازادی خۆیان بە قەفەسی ئاڵتوونی ناگۆڕنەوە.

# کارگێڕی بە گوفتار

مرۆڤ ئەو کات پیر دەبێت، کە لە پێشکەوتن و گەشەپێدان دەوەستێت

فرانکفلین ڕوزفێلت

کاتێک بیر لە ئامانجەکان دەکەینەوە، نابێت هۆکارەکان لە یاد بکەین

جەواهیر لال نەهرۆ

ئەگەر خودا بەڵا لە نەتەوەیەک بکرێت، قسەی زۆری بێ کردەوەیان دەداتێ

ئەوزاعی

ئەوەی بتوانێ جڵەوی توڕەیی خۆی بگرێت، دەتوانێت جڵەوی دوژمنەکانیشی بگرێت

مارۆن عەبود

شێواز، کاڵای بیروبۆچوونەکانە

سینیکا

کارکردن خوێی ژیانە

تۆماس فولەر



## کارگێڕی بە چیرۆك

# پرسیارێکی ئاسان؟

دەگێڕنەوە ڕۆژێك (ئەلبەرت ئەنیشتاین) لە وتنــەوەی وانەکانی بێزار دەبێت، دوای ئــەوەی چەندین داوەتنامــەی دەگاتێ، لە لایەن زانکۆو دامەزراوە تایبەتەکانەوە.

لــەو کاتەشــدا کە بە ڕێــگاوە بوو بۆ یەکێــك لــە وانەکانی، شــۆفێرەکەی پێی گــوت: بەڕێزم دەزانم کــە تۆ لە وتنەوەی وانەو وەڵامدانەوەی پرســیارەکان وەڕسو بێزاریــت، چی دەڵێیــت ئەگەر من ئەمڕۆ لە بری تۆ وانەی ئەمڕۆ بڵێمەوە؟

بە تایبەت کە من قژم لە تۆ دەچێتو لە نێوانیشماندا لێکچوونێکی باش هەیە، منیش گوێبیستی دەیان وانەی تۆ بووەمو فیکرەیەکی باشــم لە بارەی بیردۆزەی ڕێژەیی (النظرية النسبية) بەڕێزتانەوە هەیە.

ئەنیشتاین ئەم بیرۆکەیەی بە دڵ بوو، یەکسەر جلوبەرگەکانیان گۆڕییەوە.

کاتێك گەیشــتنە هۆڵــی وانە وتنەوە، شــۆفێرەکە چووە شــوێنی پێشکەشکردنو ئەنیشــتاینی عەبقــەریو لێهاتــووش لە جلوبەرگــی شــۆفێرەکەدا لــە ڕیزەکانی دواوە دانیشت.

موحازەرەکــە زۆربــاش بەڕێوەچوو، تا ئەو کاتەی پڕۆفیسۆرێك پرسیارێکی قورسی ئاڕاستە کرد، کە وای دانابوو بەو پرسیارەی دەتوانێت ئەنیشتاین شەرمەزار بکات.

لەوێــدا شــۆفێرەکە پێکەنــیو بــە پڕۆفیســۆرەکەی گــوت: پرســیارەکەت زۆر ســادەیە، بە شــێوەیەك ئێســتا من ئــەم پرســیارە ڕووبەڕووی شــۆفێرەکەم دەکەمــەوە، کــە لــە ڕیزەکانی پشتەوە دانیشتووە، تا وەڵامی بداتەوە.

شــۆفێرەکەش یەکســەر وەڵامــی دروستی دایەوە، بەشێوەیەك پڕۆفیسۆری شەرمەندە کرد.

لەم چیرۆکەوە فێر دەبین:

١- مرۆڤــە لێهاتــوو ناودارەکانیــش کەســانێکن وەکو ئێمە، بــەڵام توانیویانە بەســوود وەرگرتن لــە تواناکانیان بگەنە ئەو ئاستە.

٢- دەرگای داهێنانو پێشکەوتن لەسەر کەس دانەخراوەو هەمیشە لەسەر پشتە.

٣- هەرچەندە زیرەك بیت پێویســتە ئەوە بزانیت کە کەســانی لە تۆ زیرەکتر هەن، یا لە خوارووی تۆشەوە بن.

٤- بــا فێربین لە پێنــاوی فێربووندا پرســیار بکەیــن، نــەك بۆ دەرخســتنی ماسوولکەکانمان.

٥- دەتوانیــن ســوود لــە هــاوکاری کەســانی تر وەربگرینو هیچ کەســێك بە کەم نەزانین.



# سەرکردایەتی

ئا: هەڵگورد مەسعود شاکر

## تیۆری سەرکردایەتی:

سێیەم/ تیۆری کارلێککردن (التفاعلیە):

ئەم تیۆرەش بریتییە لە گونجاندنی نێوان تیۆری نیشانەکانو تیۆری هەڵوێست، لەسەر ئەو بنەمایەی کە سەرکردایەتی بریتییە: لە کارێکی کاریگەری کۆمەڵایەتی لە نێوان کەسایەتی سەرکردەو هەموو ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە دەوروبەری هەڵوێستی سەرکردایەتیدا ڕوو دەدەن، بە پشتبەستن بە سێ بنەما (نیشانەکانی کەسایەتی سەرکردە، بنەماکانی هەڵوێست، پێداویستییە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگا).

تیۆرێکی تر کە تیۆری (سانفوردو هەمفل) بوو، ئەوەیان دەرخست کە ئایا بارودۆخی کۆمەڵی دیاریکراو گونجاوە بۆ ئەوەی سەرکردە وا لێبکرێت کە کارلێککردنیان لەگەڵ بکات، یاخود نا؟ چەند بنەمایەکیان دیاریکرد بۆ ئەم مەبەستە کە لە گرنگترین ئەو بنەمایانە ئەمانەبوون:

١- کەسانی کارکەر: لە ڕووی ژمارەیان، چۆنییەتی جێگیربوونیان، بواری زیرەکیو ئاستی زانستیو پێشینەی کۆمەڵایەتیو ئاکارەکانیان.

٢- بارودۆخی ڕێکخراوەیی: بریتییە لە ژینگەی ناوخۆیی کە کەسەکان لە ناویدا کار دەکەن، هەر کاتێك ئەو ژینگەیە دوو دڵی تێدا نەبوو، ئەوا دەبێتە هۆکارێکی یارمەتیدەر بۆ کەسەکان لەگەڵ یەکتر، ئەمەش دەبێتە هۆی وەڵامدانەوەی سەرکردایەتیو سەرکردەش هەست بە گیانی یەك دەستەییو کۆمەڵی دەکات.

٣- هاریکاری نێوان کەسەکانو کارکەران: ئەمەش بە گوێرەی ڕێکخستنو گونجاندن دەبێت لە نێوان کەسەکان، ئەم هاریکاریەش زیاد دەکات بە پێی بوونی زیرەکیو ڕێژەی پشت بە یەکتر بەستنیانو ڕێز لە ڕای یەکترگرتن. لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کاتێك شێوازی کارگێڕی بە ئامانجو کارکردنی هاوبەش دەبێت، لە ڕەفتارو شێوازی سەرکردایەتیو سەرکردەدا ڕەنگ دەداتەوە.

٤- ڕادەی جیاوازی لە بیروڕای نێوان کەسانی کارکەر: هۆکاری ئەم جیاوازییە بە شێوەیەکی گشتی بۆ لە خراپ تێگەیشتنی بیروبۆچوونەکان دەگەڕێتەوە، کە ڕادەربڕین بریتییە لە پێشنیارو ڕەخنەو زانیاری بە پێی بیروڕای خاوەنەکەی، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە بگاتە ئاکامێکی ڕازی بوون، کە بتوانێت ناکۆکییەکان لاببات و ڕاکان یەکبخات، بۆیە پێویستە سەرکردە زۆرترین گونجاندن لەگەڵ بەردەستەکانی دروست بکات بەشێوەیەك پەیوەندییەکانیان بەهێز بکات، بۆ ئەوەی ببێتە هۆی سەرکەوتنی سەرکردایەتی.

*** هەڵسەنگاندنی تیۆری کارلێککردن:**

ئەم تیۆرە بەشداری کردووە لە دیاریکردنی تایبەتمەندییەکانی سەرکردایەتی کردن، دەستکەوتەکانی هەردوو تیۆری نیشانەکانو هەڵوێستی ڕەت نەکردووەتەوە، بەڵکو هەوڵێك بووە بۆ کۆکردنەوەیان، چونکە ئەو دەزانێت کە هەریەك لەم تیۆرە بەس نییە بۆ دیاریکردنی تایبەتمەندییەکانی سەرکردایەتیکردن.

بەم شێوەیە تیۆری کارلێککردن بەڵگەی ئەوەی دا بەدەستەوە، کە گرنگی نیشانەکانی کەسی لە پەیوەندی نێوان سەرکردەو کەسەکان هەڵقوڵاوە، ئەم تیۆرە ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کە سەرکەوتنی سەرکردایەتی پشت دەبەستێت بە توانای سەرکردە بۆ هەڵبژاردنی جۆری سەرکردایەتی، کە لەگەڵ هەڵوێستو پێداویستی بەردەستەکان، گونجاو بێت لە سایەی بارودۆخی ژینگەیی کۆمەڵایەتی، کە تایبەتمەندییەکانی سەرکردایەتی دیاری دەکات لە هەندێك هەڵوێستو کارلێککردن لەگەڵ ئامانجی خوازراودا.

## ئەرکەکانی سەرکردایەتیکردن

ئەرکی سەرکردە پەیوەستە بە فەرمان و ئەرکەکانی، ئەگەر هاتوو هەوڵەکان دیاری بکەین لە هەموو ئەرکەکاندا، ئەوا گرنگی ئەرکەکانی سەرکردەی کارگێڕیمان بۆ دەردەکەوێت. بۆیە لە باسی یەکەمدا ئەرکەکانی سەرکردەی کارگێڕی لە کاری کارگێڕی، بریتین لە پلاندانانو ڕێکخستنو چاودێریو ڕێنماییکردنو پەیوەندییەکان دەیانخەینە بەر لێکۆڵینەوە، لە باسی دووەمو سێیەمدا تیشك دەخەینە سەر ئەرك و مافەکانی سەرکردەو کێشەی لاوازی سەرکردەکان لەگەڵ دەستنیشانکردنی چارەسەرەکانیش.

### یەکەم/ ئەرکەکانی سەرکردایەتی:

١- پلاندانان:

(پلاندانان کە یەکێکە لە ئەرکە تایبەتییەکانی کارگێڕی لە بواری پلاندانانو دانانی پلانە جۆراوجۆرەکان، ئەو شێوە پلانانەی کە تایبەتن بە حکومەتو ڕێکخراو و کۆمەڵەکان). بۆیە پێویستە سەرکردە هەڵبسێت بە دانانی پلانەکانو دیاریکردنی ئامانجەکان لە شوێنی دیاریکراو لە ناو وڵاتەکەی، چونکە سەرکردەی سیاسی نوێنەرایەتی حکومەت دەکات لە دەسەڵاتی تەشریعی، لە یەکەو دەستە کارگێڕییەکان، وەك بەشەکانی تایبەت بە دروستکردنی پلاندانانی گشتی لە ناو وەزارەتەکان، لێرەوە ڕۆڵو گرنگی کەسایەتی سەرکردەی کارگێڕی دەست پێدەکات لە پرۆسە کارگێڕییە فەرمییەکاندا، پێویستە لە کاتی پەیڕەوکردنی سیاسەتە تایبەتەتییەکانی لە چوارچێوەی سیاسەتی گشتی وێنەی لێهاتوویی و بیروبۆچوونەکانی سەرکردەی کارگێڕی بە ڕوونی لەسەر دەرئەنجامەکان دەربکەوێت، ئەمەش بەوە دێتەدی کە دەبێت سەرکردە سروشتی پلانو ئامانجەکان بۆ کرێکارەکان دیاری بکات، بۆ ئەوەی کاربکەن لە چوارچێوەی خۆی پەیڕەوی بکەن، بۆیە ئەگەر ئەو ئامرازانەی کە جێبەجێی دەکەن بە هاوبەشی ئەنجامدرا، ئەوا دەبێتە گرەنتییەك بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکان بە سەرکەوتوویی، ئەمە بەدەر لەوەی خودی پلانەکان، بریتین لە کۆمەڵێك پرۆژە کەوا جێبەجێ دەکرێن لەسەر چەندین قۆناغ بە بەردەوامی لەسەر یەك ڕێگا بۆ ئەوەی پلانەکە ئامانجەکەی خۆی بپێکێت".

٢- ڕێکخستن:

"ڕێکخستن ئەرکێکی ترە لە ئەرکەکانی سەرکردەی کارگێڕی، کە بریتییە لە ڕێکخستنی چالاکییەکان، بەپێی ئەو جۆرە ڕێکخستنەی کە دەتوانێت ئامانجەکانی ڕێکخراوو دەوڵەت بهێنێتەدی، بۆیە دەبێت سەرکردەی کارگێڕی هەڵبسێت بە ڕێکخستنی یەکە کارگێڕییەکان، پاشان لە لایەنی شێوازی بێت، یاخود مرۆیی بۆ بەدەستهێنانی کار بە شێوازێکی باشتر، پایەی ڕێکخستن بەو مانایەش دێت" کە ئایا لە پرۆسەی ڕێکخستن کێ بۆ کێ کاردەکات، کێ بەرپرسەو کێ کارمەندە، دەسەڵاتەکان هی کێن؟ لێکجیاکردنەوەی پسپۆڕییەکانو گرتنە ئەستۆی بەرپرسیاریەتی لە نێوان گشت لایەنەکان".

کارکردن بەو جۆرە میکانیزمە وا لە سەرکردە دەکات لێهاتوو تربێت لە توانای خۆی، وردتربێت لە دیاریکردنی تایبەتمەندییەکانی ئەو کەسانەی کە لەگەڵی کاردەکەن لە یەکەکانی ڕێکخراودا، ئەگەر بیەوێت کارەکانی باش بن. چۆن سەرکردە پێویستە لەسەری هەڵسێت بە بڵاوکردنەوەی ئامۆژگاریو ڕێنماییەکان بۆ دەزگاکەی، هەروەها پێویستە لەسەری چاودێری ئەو ژینگەیە بکات کە لەدەرەوەی پرۆسەی ڕێکخستنە، سەرکردەی کارگێڕی لەسەریەتی دووبارە چاوپیاخشاندنەوە بکات لە ڕێکخستن، ئەگەر هەستی کرد کەوا سەلامەتیو دڵنیایی نییە لە چۆنییەتی جێبەجێکردنی ڕێکخستنەکە، دەبێت کاربکات بۆ چاککردنی خاڵە لاوازەکانو گەشەپێدانی زیاتر بە خاڵە بەهێزەکان ،چونکە سەرکردە بە مانای کارکردنی ڕۆتینی نایەت، بەڵکو بە مانای هەوڵدانو کۆششو هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی دێت.

کەواتە سەرکردە دەبێت هەمیشە چارەسەری گونجاوو خێرای پێ بێت لەو بەربەرستانەی کە دێنە پێش کارەکانی ڕێکخراو، ئەویش بە دانانی بنچینەی هاوبەش لەگەڵ ئەندامانی ڕێکخراو کە دایدەنێن بۆ چارەسەرکردنو بەرەودان بۆ زیاتر چالاککردنی ئەرکی ڕێکخستن بە مەبەستی بە دەستهێنانی ئامانجە خوازراوەکانی ڕێکخراو.

٣- هاندان:

فەرمانبەرەکانی ڕێکخراو، یان ئەو دەزگایەی کاری تێدا دەکەن زۆر پێویستیان بە هاندانو ستایشکردنە، ئەمە بێجگە لە پێداویستییەکانی تر وەکو موچەو قازانجی وەزیفیو هەستکردن بە ئاسایشو ڕێزگرتن، کە پێویستە ڕەچاوی ئەم پێداویستیانە بکرێت بۆ ئەوەی ببێتە هاندەر بۆ سەرخستنی کارەکانو بە گەڕخستنی تواناکانی فەرمانبەر. ئەرکی هاندانیش کە ئەمەش یەکێکی ترە لەو ئەرکانەی دەبێت سەرکردە پێی هەڵسێت نەك بە تەنها بۆ چەند کەسانێکی دیاریکراو، بەڵکو دەبێت هاندانەکە گشتی بێت بۆ سەرجەم لایەنو دەستەکانی دەزگاکەو یەك بە یەکی تاکەکان بۆ ئەوەی بتوانرێت بە باشترین شێوە خاڵە لاوازەکان دەستنیشان بکاتو سوودیش لە خاڵە بەهێزەکان وەربگرێت.

٤- چاودێری:

پێویستە لەسەر سەرکردە بۆ جێبەجێکردنی چاودێری دەبێت پێوەری بابەتی بەکاربهێنێت، نەك کەسی، لە کاتی پرۆسەی چاودێریکردن بۆ بە دیارخستنی ئەو هەڵانەی کە ڕوودەدات لە کارەکان، ئەو ڕێگرانەی کە کاریگەری دەبێت لەسەر بەدیهێنانی ئامانجەکانی ڕێکخراو، بەڵام پێویستە لە سەر سەرکردە چاودێری کردنەکەی لەسەر بنەمای چاککردنەوەی هەڵەکان بێت، نەك مەبەست لێی وەك ئامرازێك بێت بۆ سزادان.

چاودێری کارگێڕی ڕۆڵێکی گرنگو بەرچاوی هەیە لەسەر پێشلکارییەکانو بە فیڕۆدانی سەرمایەی دەوڵەتو ڕێکخراو، هەوڵێکی جدییە بۆ نەهێشتنی گەندەڵیو کاری نایاسایی لەسەرجەم دامودەزگا کارگێڕییەکان، کە ئەمە پرۆسەکانی تری وەك پلاندانانو ڕێکخستن تەندروست دەکات لە ڕووی پاکییەوە، بەشێوەیەکی جیاوازتر کارەکان ئاراستە دەکات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان "چونکە ئەم ئەرکە دەتوانێت هەموو کەموکورییەکانی تری ئەرکەکانی دیکە بدۆزێتەوە، یان دەستنیشانیان بکات".

٥- بنیاتنانی پەیوەندییەکان:

سەرکردە لەسەریەتی کاربکات بۆ دۆزینەوەی کەسانی شیاوو لێهاتوو بۆ دروستکردنو بنیاتنانی پەیوەندییەکی کارگێڕی لە نێوان یەکەکانی ڕێکخراو و لقەکانی تری، کەوا چۆن پێویستە لەسەری کار بکات بۆئەوەی کەناڵەکانی پەیوەندی یەکبخات لەگەڵ یەکەکانی، بە هەمان شێوە دەبێت سەرکردە درێژە بە کەناڵەکانی پەیوەندی بدات بۆ دەرەوەی ڕێکخراو، یان ڕێکخراوەکانی تر جا لە پلەی بەرز بێت، یان پلەی هاوشانی بێت، یان لە ئاستی نزمتر بێت.

دروستکردنی ئەم جۆرە پەیوەندیانەش دەبێت بە شێوازێکی ڕێكو ڕاستگۆیانە بێت بۆ ئەوەی سەرکردایەتی بە ئاسانی بزانێت چ ڕوودەدات لە ناو ڕێکخراو و دەرەوەی، نابێت سەرکردە تەنها پەرە بە پەیوەندییەکانی نێوان ڕێکخراوەکەی خۆیو ئەوانی تر بدات، بەڵکو دەبێت سەرەتا گرنگی بە پەیوەندی نێوان خۆیو فەرمانبەرەکانی بدات، چونکە دروستکردنی پەیوەندییەکان لەسەر ئاستی ڕێکخراوەکان ئەگەر پشت ئەستوربێت بە پەیوەندییەکانی ناو ڕێکخراوەکە ئەو کاتە ناونیشانی پەیوەندییە گشتییەکان وەردەگرێت بە سیفەتێکی زانستی، کارگێڕی "شتێکی بەڵگەنەویستە کە پەیوندییەگشتییەکان بەردەوام پێویستیان بە چاکردنەوەیە، ئەمەش خاڵێکی گرنگە کە نابێت سەرکردەکان لە یادی بکەن، چونکە گرنگی نەدان بە پرۆسەی بنیاتنانی پەیوەندییەکان ئەستەم دەکات".



د.محەممەد فەتحی

بەشی سێیەم

# بەڕێوەبەرەکەت بناسە

و: گۆران جەمیل

بەڕێوەبەری سادی: (بەو جۆرە بەڕێوەبەرە دەوترێت کە حەز بە ئازاردانی کەسانی دی دەکات).

کەسایەتی ئاوهایە:

١- چێژ لە ڕووداوەکان وەردەگرێت، مەسەلەکان لە سەرت قورس دەکاتەوە.

٢- ڕەفتاری دوژمنکارانەیە، هەمیشە لە کێشە دەگەڕێت.

٣- دڵخۆش دەبێتو چێژ لەوە وەردەگرێت کاتێک بە هەڵەیەکت دەزانێتو دەبینێت کە تاوانت کردووە.

٤- بە مشتەکۆڵە کەموکوڕییەکان دادەگرێتەوە، بە گاڵتەکردنەوە تەماشات دەکات.

٥- مشتەکۆڵەکانی زیاد دەکات کاتێک تۆ لە پێش هاوڕێکانتی، یان بەرپرسەکانتی، تەنانەت لە پێش چاوی میوانو دۆستانیشت.

٦- ئارەزوو دەکات کە هەمیشە هەمووان کوێرانە گوێڕایەڵی بکەن.

٧- بە ئارەزووی خۆی جێ گۆڕکێو گۆڕان بە یاساو بەندەکان دەکات.

٨- کە هەڵەی کرد دان بە هەڵەی خۆیدا نانێت، توانای چارەگردنیشی نییە.

## چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەدا؟

١- با ئامانجت ئەوە بێت کە دوور بکەویتەوە لەوەی کە ڕۆحت لاواز بکەیتو کەسایەتیت بسڕیتەوە، تێکۆشانت لە کاری ڕۆژانەدا کەم بکەیتەوە.

٢- هەستە بە ئەنجامدانی کاری چاوەڕوان نەکراو، لەو کاتانەی کە هیوایەتەکەی جێبەجێ دەکات، (کە ئازاردانی تۆیە) بووەستەو بە باشی تەماشای چاوەکانی بکە، لە سەرخۆو بە بڕواوە داوای لێ بکە کە وەک مرۆڤ هەڵسوکەوتت لەگەڵدا بکاتو پێویست بە سوکایەتی و گاڵتەکردن ناکات.

٣- لەو شوێنەی کە کاردەکەیت پێویستە ئەرکو مافەکان بە باشی بزانی چییە.

٤- بڕۆ بۆ لای بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرەکەت، بۆئەوەی دڵنیا بیت کە ئایا ئەویش بە هەمان شێوەیە، چونکە زۆر لە سادییەکان ئاڵاکانیان دەدەن بە شوێنکەوتەکانیان.

٥- لەگەڵ هاوپیشەو کارگوزارەکاندا ئەو بیرە بنیاد بنێن، کە هەستن بە بەرز کردنەوەی سکاڵا، بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەکەتان بە شێوەیەکی مرۆڤانە.

٦- ئەگەر حاڵەتی بە خراپ هەڵسوکەوتکردنی بەردەوام بوو، داوای گواستنەوە پێشکەش بکە، لەگەڵ خستنە بەرچاوی هۆکارەکانی ئەم داوایەت.

٧- ئەگەر شکستت هێنا لەوەی

که بگوازرێیتەوه بۆ کارگێڕییەکی تر، بگەڕێ بەدوای کارێکی تردا لە شوێنێکی تر.

**بەڕێوەبەری ملهوڕ:**

**کەسایەتی ئاوهایە:**

١- ستەمکاری دڵرەقی دیکتاتۆرە، پێی وایە کە ئەو باوکە، دەبێت حوکمو سەرپەرشتی کەسانی تر بکات.

٢- دەسەڵاتی کردووە بە موڵکی خۆی، رێگای دانوستان لە گەڵ کەسانی تر نادات.

٣- هەمیشە ترسی لەوە هەیە کە دەسەڵاتی لە دەست بدات.

٤- چێژ وەردەگرێتو پێی خۆشە کە هەمیشە ریسوات بکاتو ئیرادەت بروخێنێت.

٥- قسەو تێبینییەکانت لە نیوەدا دەبڕێت.

٦- ئەگەر رووبەرووی رەخنەی بکەیتەوە، ئەوا شەرت لە دژ رادەگەیەنێت.

**چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەدا:**

١- با ئامانجت ئەوە بێت کە بە جۆرێك رەفتار بکەیت، کە بە شێوەیەکی تێگەیشتوانە هەڵسوکەوتت لەگەڵدا بکات.

٢- خۆت بە دەستەوە مەدە، چونکە تێکت دەشکێنێ، وا دەکات کە میزاجت لە دەست بدەیت، چونکە ئەو ئەمەی دەوێت.

٣- خۆڕاگرو بەهێزو جێگیر بە، بە بێ هەڵچوون، لە سەرخۆبە، لە هیچ هەڕەشەیەکی مەترسە.

٤- هەوڵ بدە کە رێزت لێبگرێت، سەرنجی بۆ لای خۆت رابکێشیت.

٥- بە کۆمەڵێك پرسیار رووبەرووی بەرەوە، بۆئەوەی بۆی بسەلمێنیت کە تۆ ئارەزووی گفتوگۆکردنی جدیت هەیە لەگەڵیدا.

٦- ئەومت لە یاد نەچێت کە ئەویش مرۆڤە، زۆرجار خاوەنی بیری تیژە، پێویستی بە هاورێیە، بەپێی توانا سوودی لێ وەربگرە.

٧- ئەگەر بە جدی هەوڵتداو سەرکەوتو نەبوویت لە گۆڕینیدا، ئەوە هەوڵی دۆزینەوەی کارێکی تر بدە، بۆئەوەی ژێریت لە دەست نەدەیت.

**بەڕێوەبەری پەکخەر:**

**کەسایەتی ئاوهایە:**

١- بیروڕاکانی پێشکەش دەکات بە مەبەستی پەکخستنی بۆچوونەکانی تۆ.

٢- ئەگەر بیروبۆچوونەکە هی ئەو بوو، ئەوا زۆر باشە، بەڵام ئەگەر بیری تۆ بوو، ئەوا خراپەو کێشە دروست دەکات.

٣- جگە لە خۆی ئارەزوو ناکات بۆچوونی کەس دەرکەوێت.

٤- پێی وایە کە تۆ نەزانیو هەست بە هەوڵەکانی ئەو ناکەی کە داویەتی بۆ باشکردنی سیستەمی کار.

٥- پێی وایە کە تۆ هەوڵی رووخاندنی ئەو دەستکەوتانە دەدەیت، کە ئەو دروستی کردووە لە کارەکەدا، لە پێش هاتنی تۆ، تەنانەت پێی وایە کە تۆ رقت لە ئەوە.

٦- هەرگیز ئەوە لە بیر ناکات کە تۆ جارێك لە جارەکان پێشنیارێکی هەڵەت کردووە لە رابردوودا، هەردەم بیرت دەخاتەوە، لە پێش چاوی خەڵك.

**چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەدا:**

١- با ئامانجت ئەوە بێت کە پێشنیارو بۆچوونەکانت بە شێوەیەك بخەیتەڕوو کە کێشەت بۆ دروست نەکات.

٢- پێشنیارەکانت بە شێوەیەك کە لە ئەنجامی بۆچوونەکانی ئەوەوە بۆت هاتووە.

٣- کاتێك پێشنیارەکەت پێشکەش دەکەیت، سەرەتا پرسیاری لێ بکە کە ئایا کاتی تەواوی هەیە بۆ گوێگرتن لێت؟

٤- ئەگەر داوای ئەوەی کرد کە ماوەی بدەیت بۆئەوەی کە لێکۆڵینەوە لە پێشنیارەکەت بکات، وا بکە کە ئەو بۆخۆی ماوە دابنێت.

٥- کاتێك قسەی لەگەڵدا دەکەیت، لە بیرت نەچێت کە نەرمونیانو کراوە بیت، لەگەڵ ئەوەی کە دەبێت متمانەت بە خۆت هەبێت.

**بەڕێوەبەری دووڕوو:**

**کەسایەتی ئاوهایە:**

١- هەڵسوکەوتت لەگەڵدا دەکات بە شێوەیەکی دوو ڕووانە، رەنگە هەندێجار چەندین رووی هەبێت، لە هەڵسوکەوتی لەگەڵ یەك کەسدا.

٢- نابێت متمانەی پێ بکرێت.

٣- هەڵخەڵەتێنەر ناپاکو ستەمکارە.

٤- رووبەرووی راستییەکانو ژمارەکان دەبێتەوە بەو شێوەیەی کە خۆی دەیەوێت.

٥- چاوەڕوانی لێدەکرێت کە پێچەوانەی ئەوە بکات کە خۆی دەرخستووە.

٦-ترسنۆکەو توانای رووبەڕوو بوونەوەی نییە.

**چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئەم جۆرە سەرۆکانەدا:**

١- با ئامانجت ئەوە بێت بگەیت بە وەڵامێکی روونو راستگۆیانە، بۆ ئەوەی بزانیت لە کوێدا وەستاوە، بۆ ئەوەی نەخشەکەت لەسەر ئەو بنچینەیە دابنێیت.

٢- رووبەڕووی پرسیاری بکەرەوەو داوای وەڵامی راستەوخۆی لێ بکە، رەنگە ئەوە تۆ بیت کە گومانی خراپی پێ دەبەیت، تۆ لە پێشتر گوێت لە قسەی نەگرتووە، ئەویش تۆی هەڵنەخەڵەتاندووە.

٣- رازی مەبە بە هیچ شتێك بە شێوەی زارەکی، بەڵکو داوای لێبکە کە بە نوسراو بۆت بنووسێت، یان لە پێش چاوی کۆمەڵێك لە خەڵکی بیڵێت، بەتایبەت ئەگەر پەیمان بێت بە پلە بەرزکردنەوە، یان پاداشتکردن.

٤- ئەگەر راپۆرتێکت پێشکەشکرد داوای لێبکە کە واژۆی وەرگرتنی راپۆرتەکە بکات، پاشان کۆپییەك بۆ خۆت هەڵگرە، بۆ کەسانێکی پەیوەست بە کارەکەی بنێرە.

٥- ئەگەر ئەو بۆچوونەی تۆ راست بێت، کە -دووڕووە- ئەوە ترسنۆکە، توانای نییە تا رووبەڕووی کەس ببێتەوە، هەر بۆیە هەڵسوکەوتی دووڕوانەو هەڵخەڵەتێنەرە، ئەگەر هەستت بەمە کرد، ئەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکە، وەك ئەوەی کە چۆن لەگەڵ دووڕوویەکدا دەکرێت.

٦- ئەگەر بۆت دەرکەوت کە هەڵخەڵەتێنەرە، وەك پڵنگ خۆی حەشارداوە لە بەرگی پشیلەدا، ئەوە هەستە بە دوورخستنەوەی فرۆفێڵەکانی، پێش ئەوەی کە ئەو تۆ بخواتو چێژ لەم خواردنە ببینێت.



# کەی دەبێت سەرۆک..... داوای لێبوردن بکات؟

ن: باربارا لیکیرمان
و: عومەر عەبدولقادر

به گشتی ئەو کەسەی هەڵەدەکات، تەنانەت ئەگەر هەڵەکەشی به ئەنقەست نەبووبێت، پێویستە داوای لێبوردن بکات، بەڵام ئەم کارە بە گوێرەی سەرۆکەکان جیاواز دەبێت، چونکە داوای لێبووردنکردن لە مەسەلەیەکی تایبەتییەوە دەگۆڕێت بۆ خەمو گرفتی ڕای گشتیو چوارچێوەیەکی فراوانتر وەردەگرێتو ڕادەی گرژیو ئاڵۆزیش زیاتردەبێت.

دەکرێت لە سەردەمی ئێستاماندا، داوای لێبوردنکردنی سەرۆك، بە پلان، یان تەکتیکێکی ژیرانەو تۆکمە دابنرێت. ئەم پلانو تەکتیکەش بە وریایىو لێزانییەکی زۆرەوە بەکار دەهێنرێن، تا پەرچەکرداری ڕای گشتیو دەرکەوتن بە ڕوویەکی پەشیمانی تاوانبارەوە، کەم بکرێتەوە.

زۆربەی ئەو داوای لێبوردنانە لە ناو ئەو سەرۆکانەدا بڵاوە کە سەرۆکایەتی کۆمپانیاکانی فڕۆکەوانی، یاخود کۆمپانیاکانی پەیوەندیکردن، یان گواستنەوە دەکەن. ئەویش بە هۆی پەککەوتن، یا ڕووداوێك، یان دواکەوتن لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریدا.

شایەنی باسە، داوای لێبوردنکردن ڕەنگدانەوەی کلتورو ئاستی ڕۆشنبیریی سەرۆكو بگرە هەموو کۆمەڵگەشە، بەڵام ئایا ئەم کلتورو ڕۆشنبیرییە، بەندە بە ڕۆشنیو ڕاشکاویو دانپیانانی خێراوە بە هەڵەکەدا؟ یاخود ئایا داوای لێبووردنکردن کارێکی دەگمەنەو بە چەشنێك هەندێك گەل بە نەنگیو شوورەیی دادەنێن؟ بۆ نموونە لە یاباندا داوای لێبوردنکردن -بە داوای لێبووردنی سەرۆکیشەوە بۆ بەردەستەکەی- بە کارێکی زۆر ئاسایی دادەنرێتو بەشێکە لە ڕەفتارو ئاکاری خەڵکەکەی. لێرەدا باسی ئەوە دەکەین کە چۆن پاش تێکشکانی یابان لە جەنگی جیهانی دووەمدا، ڕاستەوخۆ ئیمپڕاتۆر داوای لێبووردنی لە گەلەکەی کردو دەستبەرداری پلەی بەرزو نازناوەکەی بوو. ئەمەش پێچەوانەی کۆمەڵگەی ئەمریکاییە، لەو دەمەدا کە (ڕیچارد نیکسۆن) سەرۆکی ئەمریکا، داوای لێبووردنی لە ڕووداوی (ۆتەرگەیت) کرد، ئەم ئاکارەی بە بە ئابڕووچوون بەسەریدا شکایەوە.

ئەو سەرۆکانەی داوای لێبووردن دەکەن، تا ڕادەیەکی زۆر بە کەسانێکی هەستیارو سەرڕاست ناودەبرێن، لەگەڵ ئەوەشدا داوای لێبووردنکردن ئاوێنەیەکە، یان ڕووخسارێکە متمانە بە خۆبوونو دلێری حەشار دەدات.

ئەوەی بەسەر (بێڵ کلینتۆن)ی سەرۆکی پێشووی ئەمریکادا هات، نموونەیەکە بۆ ئەم باسەی ئێمە، کاتێك بڕیاری دا خۆی لە دەستی دەستیو نکۆڵیکردن ڕزگار بکات، دانی نا بە پەیوەندییەکەی لەگەڵ (مۆنیکا لوینسکی)و تێوەگلانە بەدڕەوشتییەکەی پشتڕاست کردەوەو پەشیمانی خۆی دەربڕی.

* چوار ئامانج لە داوای لێبووردنکردندا:

١- ئامانجی تایبەتی: ئەوەیە کە سەرۆك لە هەڵەیەکەوە گلاوە، ئێستاش دانی پێدادەنێت، داوای لێبوردنی لەسەر دەکاتو لە پەیڕەوانی لێبوردنو لە بیربردنەوەی هەڵەکەی دەخوازێت.

٢- ئامانجی کارگێڕی: ئەوەیە کە یەکێك لە ژێردەستەکان، یان زیاتر لە ژێردەستێکی سەرۆك هەڵەیان کردووەو ناچاردەبێت، بە مەبەستی گێڕانەوەی تەباییو یەکڕیزی

ناو ڕیزەکەی و چاککردنەوەی ناووناوبانگی، داوای لێبووردن بکات.

٣- ئامانجی بە کۆمەڵ: ئەوەیە کە ژێردەستێکی سەرۆك، یان زیاتر، هەڵەیەکی ئەنجام داوەو بووە بە هۆی خراپەو زیانگەیاندن بە کەسێکی دەرەوەی دەستەو پێڕەکە، ئیدی سەرۆك ناچار دەبێت -بۆ چاککردنەوەی پەیوەندییەکان لەگەڵ ئەو کەس و لایەنەی زیانەکەی پێگەیشتووە- داوای لێبووردن بکات.

٤- ئامانجی ئاکارییانە: ئەمەیان جوانترینو شکۆدارترینی ئامانجەکانە، بە جۆرێك سەرۆك، لەبەر ئەو هەڵانەی ئەنجامی داون— تایبەتی بن، یان کارگێڕی- هەست بە پەشیمانییەکی ڕاستەقینە دەکات. ئەم هەستەش هانی دەدات، تا داوای لێبووردن بکاتو هەوڵی قەرەبووکردنەوەو بەخشینی لە هەڵەکەی بدات!

بەم چەشنە دەبینین سێ ئامانجەکەی یەکەم، لە چەند ستراتیژییەتو پلانو بەرژەوەندیی تاکە کەسی و تایبەتەوە سەرچاوە دەگرن، لە کاتێکدا ئامانجی چوارەم و کۆتایی بەندە بە چەسپاندنو سەلماندنی هەقو ڕاستی و ئەنجامدانی کاری ڕاستو دروست.

* کرۆکی داوای لێبووردنکردن:

کرۆکی داوای لێبووردنکردن، لە ڕاستی و دروستی سەرچاوەکەی و باشی کاتەکەی و لە خۆگرتنی ئەم چوار بنەمایەی خوارەوەدا، خۆی دەنوێنێت:

١- ڕاستگوتنو دانپێدانانی هەڵەکە.

٢- لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی.

٣- پەشیمانی دەربڕین.

٤- بەڵێنی ڕاستدان لەسەر دووبارەنەکردنەوەی هەڵەکە.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو چوار خاڵەی باسکرانو شیکردنەوەو پیادەکردنیان بەسەر ڕەفتاری (بێڵ کلینتۆن)دا، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە چۆن داوای لێبووردنەکەی، زۆربەی ئامانجەکانی بەدیهێنا، چونکە لەسەر ئاستی خێزانو کارگێڕی و کۆمەڵدا، پەیوەندییەکانی لەگەڵ خێزانەکەی و ژێردەستەکانی و گەلەکەیدا چاك کردەوە، هەروەها داوای لێبوردنەکە مەرجی دانپێدانانی هەڵەکەو لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتیشی تێدابوو. ئەمەش بووە هۆی بێدەنگکردنی ئەو هەراو هەڵمەتی ڕاگەیاندنەی کە هێرشی کردبووە سەر، ڕێژەی دەنگەکانیشی لای دەنگدەرانو لایەنگرانی، بەرزبووەوەو تا کۆتایی ماوەی سەرۆکایەتییەکەشی هەر بەو بەرزییە مایەوە، چونکە ئاستی پشتگیریکردنی خۆی پاراست، بە شێوەیەك لە هەموو کاتەکاندا لە ٦٦٪ کەمتر نەبووە.

* ئەو سەرۆکانەی داوای لێبووردنکردن ڕەت دەکەنەوە:

بە پێچەوانەی ئەم نموونانەی پێشوو، کە تایبەت بوو بەوانەی داوای لێبووردنیان کرد، کەسانێکمان بەرچاو دەکەوێت، ڕێگری لە پەیڕەوکردنی ئەم ڕەفتارە دەکەنو بە تەواوی ڕەتی دەکەنەوە.

دیارترین نموونەی ئەم جۆرە ڕەفتارە (رایمۆند گیلمارتن)ی سەرۆکی جێبەجێکاری کۆمپانیای (میرك)ی دەرمانسازییە، کە لە نێوان سالانی ١٩٩٤-٢٠٠٥ سەرۆکایەتی ئەو کۆمپانیایەی کردووە، سەرباری ناووناوبانگی باشەی، بە درێژایی ماوەی سەرۆکایەتییەکەی، بەڵام کۆتا مانگەکانی سەرۆکایەتییەکەی، بۆی بوو بە کۆڵێك سەختی و گرفتاری، بە شێوەیەك نزیکەی ٧٠٠٠ سکالا، لە دژی کۆمپانیا بەرزکرایەوە بۆ دادگا، ئەویش بە هۆی بەرهەمهێنانی دەرمانی ئازارشکێنی (فیوکس)ەوە، کە توێژینەوەکانی ڕێکخراوی خۆراكو دەرمان، مەترسییەکانی ئەو دەرمانەی لەسەر دڵ سەلماندبوو، ببووە هۆکاری مردنی ١٣٩٠٠٠ نەخۆشیش! ئەمەش خۆی لە خۆیدا کارێکی پڕمەترسییەو پێویستی بە داوای لێبووردنو قەرەبووکردنەوە هەیە، بەڵام گیلمارتن هیچ هەستی نەبزواو موچوڕکەیەکیش بە گیانیدا نەهات، بەڵکو پەنای بردە بەر بێدەنگییەکی سەیر! کاتێکیش تۆمەتەکەی ڕووبەڕوو کرایەوە، بە توندی بەرگری لە خۆی و لە پێگەکەی کردو بە بێزارییەوە گوتی: «ئێستەشی لەگەڵدا بێت، کۆمپانیا پەیڕەوی لە بەرنامەو توێژینەوەی زانستی وردو ڕوون سەقامگیر کردووە». تەنها بەرگری لە خۆکردنەکەی لەمەدا کورت نەکردەوە، بەڵکو درێژەی پێداو کار گەیشتە سەر ئەوەی هێرش بکاتە سەر نەیارەکانی و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە: «ئەوان زانیاریی نادروستو ناتەواویان بلاوکردووەتەوە. کاتێکیش ئەم هاوڕێیەمان ناچار بە دەست لە کارکێشانەوەکرا، هیچی نەگوتو هیچ شتێکیشی نەکرد کە بەڵگە بێت لەسەر بەرپرسیارێتی لە ئەستۆگرتن، یاخود هەر پەشیمانبوونەوەش.

لێرەدا ئەوەی گیلمارتن دەیکرد بە بیانوو بۆ ڕەتکردنەوەی داوای لێبووردن ئەوەبوو: داوای لێبووردنکردنی سەرۆك لە هەڵە تایبەتییەکانی، جێنشینانی دەخاتە ناو بازنەی تۆمەتەوەو بە خراپیش بەسەر هەموو بەش و کەرتەکانی دامەزراوەکەدا دەشکێتەوە. ئەمەش وا دەکات دامەزراوەکە ببێت بە ئامانجێکی گوشارەکانی بازاڕو نێچیری چەوری خواستو تەمای کێبڕکێکارانو نەفرەتو زەبری توندی کۆمەڵگە لە خێرا بڕیاردانیانو سەپاندنی سزاکان بەسەریدا.

* داوای لێبووردنکردن لە نێوان ناچاری و سەرپشکیدا:

داوای لێبووردنکردن، هەر وا ئاسان نییە.. چونکە لە کۆتاییدا بڕیارەکە بۆ ئەو کۆمەڵگەیە بەجێدەهێڵدرێت، کە ڕەنگە ئەو سەرکردەیە بەرزبکاتەوە، تا ئاستەکانی پاڵەوان، لەوانەشە بیکات بە قۆچی قوربانی، یان تاوانبار.

لە سەروبەندی لابردنی (کارلی فیۆرینا)، لە سەرۆکایەتیکردنی کۆمپانیای (هیلۆیت باکارد)دا، نووسەرێکی ڕۆژنامەی (وۆڵ ستریت جۆرناڵ) لێی پرسی: (ئایا داوای لێبووردنکردنی سەرۆك بە ئاشکرا، بە خۆکوژیی کارگێڕی دادەنرێت؟ ئایا پێویستە سەرۆك، هەمیشە تاجی متمانەو سەرکەوتن لەسەر بنێت؟).

بە شیکردنەوەی ئەم دووپرسیارەو خوێندنەوەی ڕووداوە بەردەستەکانو بەڵگەکان، دەگەین بە ئەو ئەنجامەی کە سەرۆك مرۆڤەو مرۆڤیش لە هەڵەو کەموکورتی بە دوورو پارێزراو نییە. لەگەڵ ئەوەشدا پێویست ناکات، داوای لێبووردن لەو هەڵە تایبەتییانەی بکات، کە زیان بەدامەزراوەکەی ناگەیەنن. پێویستیش ناکات وا پێشبینی بکرێت، کە سەرۆکی جێبەجێکردن کەسێکی نمونەییەو خاڵی لاواز بێتو نییەتی. هەروەها ڕەنگە داوای لێبوردنکردن بەس بێت، ئەگەر یەکێك لە یاریدەدەرانی سەرۆك —نەك خودی سەرۆك— بەم کارە هەستا، تا دوور بن لە پشێوی و هەرای بێپاساو.

بەم شێوەیە هەر داوای لێبووردنێك کە پەیوەندی بەو ئامانجو ڕەگەزانەی پێشووەوە نەبێت، هیچ سودو کەڵکێکی نابێت، بەڵکو لەوانەیە بە خراپ بشکێتەوەو زیانەکانی، لە سودەکانی زۆرتربن. بە پێچەوانەشەوە هەر ڕاستە، کاتێك داوای لێبوردنەکە لە کاتو شوێنی شیاوی خۆیدا بێت.

لێکۆڵینەوەو شیکارییەکانی پسپۆڕانی پەیوەندییە گشتییەکان، سەلماندوویانە کە ئەنجامەکانی داوای لێبوردن نەکردن، زۆر لە ئەنجامەکانی داوای لێبوردنکردن خراپترە، چونکە ئەو زەحمەتو نارەحەتییەی هەڵەکە بەسەر کەسەکەیدا دەهێنێت زیاد دەبێتو گیروگرفتەکانیش، زیاتر شێواو دژوارتر دەبن.

سەرچاوە: المحفزة الإدارية ٢٠٠٨



# جۆرەکانی بەڕێوەبەر

وەهاب حەسیب محەمەد

لە دنیای بەڕێوەبردندا بەڕێوبەرەکان ڕۆڵێکی کاریگەریان هەیە لەسەرچۆنییەتیو بەرەوپێشبردنی دامەزراوەکانو کارمەندانیان بەو پێیەی لە لوتکەی بڕیاری دامەزراوەکاندان، بەڵام ئەوانیش زادەی ڕۆژگارو بیرکردنەوەی خۆیانن، بەدەر لە کاریگەری لایەنی دەرەکی بەسەریانەوە، زۆجار ئەو کاریگەریانە ڕەنگدانەوەی هەڵسوکەوتو بڕیارەکانی بەڕێوەبەرە لەگەڵ بەردەستانو هامۆشۆکارانی دامەزراوەکەدا، یاخود بەو پێیەی ئەو ژینگە ئۆتۆکراتیەی لە زۆرێك وڵاتانی دنیادا هەیە، بەڕێوەبەرەکان جیاکاری دەکەن لەگەڵ هاوکارانیان، ئەوەش بە دوورەپەرێزیو خۆ لە قاڵبدانیان لە چواردیواری ژووری تایبەتدا، لە کاتێکدا بیردۆزە نوێیە کارگێڕییەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە بەڕێوەبەر نابێت ژووری تایبەت بەخۆی هەبێتو پێویست نەکات نابێت مۆبایل (تەلەفۆن) بەکاربهێنێت تا زیاترو باشتر ئاگاداری بەڕێوەچوونی کارەکان بێت لە دامەزراوەکەدا.

بۆ زیاتر ناساندنو جۆری جیاواز لە بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتی بەڕێوەبەرەکان دوو جۆریان شیکار دەکەین.

**بەڕێوەبەری ئەوباسی:**

(جۆن ئەدیر) باسی دابڕان دەکات لای هەندێك بەڕێوەبەرەکانو دەڵێت: هەندێك لە بەڕێوبەرە جێبەجێکارەکان لە داریی ئەوباسی دەچن کە گەردن کەشانە ڕادەوەستێت، بەڵام بە تەنهایی، چونکە ئاویی دەوروبەری خۆی لە ڕووبەرێکی فراواندا هەڵدەمژێت، بەشێوەیەك ناهێڵێت هیچ ڕووەکێك لە دەوروبەری بڕوێت، هەمان شت بە باوەڕی ئەدیر -لە جیهانی بەڕێوەبردندا ڕوودەدات- لەوێش لێکچوونێکی زۆر هەیە لە نێوان داریی ئەوباسی گەرمەسێرو ئەو بەڕێوەبەرانەی کە ماوە بۆ کەسانی دەوروبەریان ناهێڵنەوە بژینو گەشە بکەن، دواتر خاوەنی ئابڕوو ڕێزلێنان بن. ناچارن ئەو شوێنە جێبهێڵن بۆ بەڕێوەبەرو دەستو پێوەندە کورتەباڵا بێسوودەکانی، کە زیاتر خۆزگە دەخوازنو هەستی زیاتریان بۆ دروست دەبێت دەربارەی گرنگی ئەو دامەزراوەیە، کاتێك خاڵی دەکرێتەوە لە کەسانی تایبەتمەند، ئەو جێگایانە پڕ دەبێت لە کەسانی کورتە باڵاو نموونەکانیان لە کەسانی داهێزراو سست.

لە بێئاگایی بەڕێوەبەری ئەوباسی هاوشێوەی داریی ئەوباسی کە لە ڕەوشتدا هاوشێوەن، پێیوایە کایەی کۆتایی ئەو ڕکابەرییەی بردووەتەوە کە لە بیری نەخۆشیدا وێنای کردووە، کاتێك بەو هەڵسوکەوتە ناکامە پوختەیی فەرمانبەرە بە تواناکانی ناچار دەکات شوێنی کارکردنیان بە جێبهێڵن.

هەڵبژاردنی چۆڵکردنی دامەزراوەکە کەسێك بڕیار دەرە تیایدا کە هەستی خۆ بەزلزانینی بەشێوەیەکی زیاد تیادا دروست بووە. هەستێکی شاراوەی دوژمنکارانەیی بەرامبەر بە کەسانی سەرکەوتوو هەیە. بەڵام ئەم کەسە لاوازە (خاوەن هەڵسوکەوتی نەشیاوە) نازانێت بەم ڕەوشتانەی زەرەرمەندی ڕاستەقینە تەنها خودی خۆیەتی نەك ئەو کەسە تایبەتمەندانەیی دامەزراوەکەیان لێهێناوەتەوە یەك. ئەو پێشتر بڕیاری داوە ئەوان ڕکابەرو دوژمنی ڕاستەقینەن، دەبێت ڕێگایان پێ چۆڵبکرێت تا هەست بە دەسەڵاتی ڕەها بکاتو کەشی دامەزراوەکە پاکژ بکرێتەوە لەو کارمەندانەی لە کەمیندان بە مەبەستی پاکتاوکردنیان بەرەی ژێریان دەربهێنرێت!! جەنابی بەڕێوەبەر نازانێت هێزی ئاوەزی ناپاکی لەگەڵدا کردووەو ئەوی داوەتە دەست کۆمەڵێك هەڵسوکەوتی هەڵە، کارەکانی لێ هەڵگێڕاوەتەوەو بە پێچەوانەوە تەگبیری بۆ کردووەو لە کۆتاییدا پێچەوانەیی ئەوەی دەیویستو ئاواتی بۆ دەخواست پیشانی دەدات.

لە کاتێکدا بوونی فەرمانبەرانی تایبەتمەند قەڵغانێکی ڕاستەقینە بوون لە دەوری نەك مەترسیو هەڕەشە لە بوونی بەڕێوەبەر کاتێك ئەو لە لوتکەیی دامەزراوەکەدایە.

کەسانی کاریگەر هەمیشە بیرۆکەی پێشوەختیان هەیە بۆ بەرەوپێشچوونی ژینگەی کار، بۆ باشکردنی بەرهەمو چاککردنی (مخرجات) ئەنجامی گەڕاوەی کار، خاوەنی ئەوانەن کە باسکران بە هۆی توانایی تایبەتیانو پێداگریان بە شێوەیەکی خۆرسك لەسەر باشکردنی کارەکانیان، ئەو کارمەندە تایبەتمەندانە بینینێکی تیژیان هەیە بە مەبەستی چۆنییەتی خۆلادان لە کێشەکان، یان کەمکردنەوەی قورسایی کاتێك ڕووبەڕووی دامەزراوەکە دەبێتەوە. ئەمانە وەك بەلگە ناهێنرێنەوە کە بەڕێوەبەری ئەوباسی بە لایاندا بچێت. بەلام بەداخەوە لە توانایدا نییە پالفتەیەکی ژینگەیی مێشکی بکات، یاخود بڕیارە قورسەکانیان لەسەر کەم بکاتەوە بەڕێوەبەری ئەوباسی زۆر زەرەرمەندە بە هۆی ئەو زیادە ڕەوییەی دەیکات لەگەڵ ئەو گروپە تایبەتمەندە، یاخود لەگەڵ کرێکاراندا. بەشێوازی زۆدارانەیی ناچاری ڕۆیشتنیان دەکات، گۆڕەپانەکە چۆڵ دەکات بۆ خۆییو کورتەبالاکانی چواردەوری.

بەلای کەسی هۆشیارەوە ئەوەی جێگای گومان نییە سەرەتای ڕاست تەنها ئۆبالدارە بۆئەوەی ئەنجامی ڕۆیشتنی لێ بکەوێتەوە شایانی ڕێزو پیاهەڵدان بێتو هەرچی پێشەکی لاوازە کە بەڕێوەبەری ئەوباسی هەڵیدەبژێرێت سەرەتایەکی خەیاڵیو لاوازە. تەنها لە خزمەتی کەسایەتییە لاوازو تێڕوانینە تەسکەکانیدایە، بەرامبەر ژینگەی نمونەیی لە توانایدایە چوارمشقی لەسەری دابنیشێت، دوور لە هەر پێشهاتێك خەو کە چاوانی بتۆرێنێت.

هەندێك لەم جۆرە لە بەڕێوەبەران لەوانەیە پیرۆزباییان لێبکرێت. بەلام پاشان زۆرێك لە دەست دەدات، کاتێك تەماشا دەکات ئەو توانا مرۆییانە هەڵدەکشێنو دامەزراودیەك بە تەواوی لە گەڵیاندایەو باوەڕیان بە دڵسۆزان هەیە، بەدوای کەسانی سەر ڕاستدا دەگەڕێنو لەگەڵیان بە پەیمانن، چاوەڕوانیانن. سەیرکە کام لەو دووتیپە یاری دواییان بردەوە، کامیان زەرەرمەندبوون؟

## ٢- بەڕێوەبەری کارا:

بە پێچەوانەی داریی ئەوباسی گەرمەسێرەوە کە وەك نموونە وەرمان وەرگرت بۆ ئەو بەڕێوبەرانەی خولیای پاکتاوکردنی توانا پیشەیەکانییانە، تا بناگوێچکەیان ڕۆچووەو لە جۆرەها دڵە ڕاوکێدان، (کە پەروەردگار بۆ هیچ دەسەلاتێك باسی نەکردووە دەربارەی پێشبینیکردنو تیاچوونی دەسەلاتیان لە کاتێکدا توانا مرۆییەکان لەسەر کارەکانیان بمێننەوە لە دامەزراوەکاندا کە بەڕێوەبەری ئەوباسی سەرپەرشتیارێتی).

لەم ڕووپەڕەدا نموونەیەکی جیاواز نیشان دەدەین، نموونەیەکی تەواو جیاواز بەرامبەر نموونەی ئەوباسی لاواز. ئەم نموونەیە کەسایەتییەکی ڕێزدار دەگرێتە خۆی کە خاوەن هەستێکی پێشکەوتویی بەڕێوەبردنە، خاوەن هەستێکی باشە، هاوکات خاوەن توانایەکی زۆرە لە بڕوا بوون بە خۆدا، هەستی بەرپرسیارێتی بەرزە بەرامبەر گەشەکردنی ژینگەیی کار، ماوە دەدات بە توانا مرۆییەکان تا شوێنی شیاوی خۆیان وەربگرن، دەربڕی بیروبۆچونەکانیان بن بەدەر لەوەی خەفەیان بکات، یاخود لە ڕێگای کاردا کەنار گیریان بکات، وەك چۆن بەڕێوەبەری ئەوباسی دەیکرد.

بەڕێوەبەری کارا کەسێکە خاوەن تەندروستییەکی باشەو هیچ گرێیەکی دەرونی نییە تا دڵسۆزانی پێ تاوانبار بکات، یان ناچاربێت خۆی لێیان ڕزگار بکات، ئەرکی سەرەکی ئەوەیە کە خۆی بۆ ئامادەکاتو دەیکات بە سەنگی مەحەكو بەر لە کەسانی دی تواناکانی جێگیر دەکات لەسەر تایبەتمەندیو سەرکەوتن، ئەو کارەش هاندانە بۆ کارمەندان، پوختەیی کارمەندان هەڵدەبژێرێت تا هاوشانی بنو بەهۆیانەوە بەهێز دەربکەوێت، بگەڕێتەوە بۆ لایان (پرسو ڕایان لە تەکدا بکات)و لەگەڵیاندا تیپێکی هاوشێوەو هاو ئامانج دروست بکات بەرژەوەندی گشتی لای هەریەکێکیان لە پێش هەر شتێکەوە بێت، بەرپرسی نوێ پیشەوایەکی ڕاستەقینەیە خاوەن هەستێکی بەڕێوەبردنە. شارەزایی ئەو شارەزایی مامۆستایەكو گوڕوتینی کارمەندێکی چالاکە. ئەو تێدەگات کە نهێنی پێشەوایی چالاك شاراوەیە لە دەرچووانی پۆلێکی تازە لە ڕەگەزی شارەزا لە کارمەندان بە هیوایی پشتگیریکردنی ئامانجەکانی دامەزراوەکەو پاراستنی دەستکەوتەکانی.

(کارلۆدی بنیدیتی) سەرۆکی ئەنجوومەنی بەڕێوەبەری کۆمپانیای (ئینج ئۆلیفیتی)ە، یەکێکە لە باشترین نموونەکانی ئەم پەیڕەوە نوێیەی پێشەوایەتی داهێنان لە بواری کارگێڕیدا. ئەو ئێستا پەنجاویەك ساڵ تەمەنییەتی. بە ئەفسانەیی سەرکەوتنی کارگێڕی دادەنرێت لە ئیتالیادا ناووناوبانگی کارلۆدی لە هەڵکشاندایە. بەڕێوەبەرانێك کە لە ڕیزی یەکەمدان بیردەکەنەوە لە ئاستی توانایی بەڕێوەبەرایەتی پێشڕەو خەمخۆر. کارلۆدی بیر لە نەوەی داهاتوو دەکاتەوەو دەپرسێت: چی لە دوایی خۆم بەجێدەهێڵم؟ خەڵکی دوایی خانەنشین بوونم، یان جێهێشتنی ئەو دەزگایە دەپرسن ئاخۆ من ئەو کارمەندانەی لە چوار دەورم بوون هانم داون لەسەر گەشەکردنو پێشکەوتن، ئەگەر ئەوەم نەکردبێت واتە هەڵنەستاوم بە کارەکەم وەك پێشەوایەكو ئەرکەکانم تەواو نەکردووە بەم شێوەیە کارلۆدی لایەنگیری بەرژەوەندی بالایە، چاوەکانی لەسەر ئەرکە بنەڕەتییەکان گیرساوەتەوە، ئەوەش بریتییە لە دۆزینەوەی ناخی بەردەستانو ڕەخساندنی بوار بۆیان تا تواناکانیان بسەلمێنن. کاتێك ڕەگەزێکی تازە دێتە بوارەکەوە زیاتر گرنگی پێدەدرێت، بەڕێوەبەری ناوبراو نزیکی دەکاتەوە لە خۆی، ئەوەی شایانی بێت لە ڕێزو چاودێری لێدەگرێتو پێشکەشی دەکات تا ئەو ڕەگەزە زیاتر شارەزاو بەهێز بێت لە بوارەکەدا زیاتر گرنگی پێدەدرێتو دەردەکەوێت. کارلۆدی خۆشاوی سەرکەوتنی تامکردووەو هەستی بە تامی بەدەست هێنان کردووەو هەستی هاولاتی بوونی تیا بەدیکردووەو ڕاستی پەیوەستبوونی بەکارەکەیەوە دیوە.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ڕاستی پەیوەست بوون بەلگە بێت لەسەر کەسانی خاوەن شارەزایی نوێ تا پێشکەوتنو گەشەکردن بە پێوانەیی خۆیان پێوانە بکەن. هاوکات گەورەترین ناپاکی ئەوەیە تواناکان لە قالب بدرێنو ئاریشەیان بۆ دروست بکرێتو دوور بخرێنەوە لە بازنەی بڕیارو کاریگەریی، ناپاکی سەرکردەی سەربازی بە گەورەترین تاوانکاری دادەنرێتو ناپاکی بەڕێوەبەرایەتی بریتیە لە دژایەتی تواناکانو ڕاوەدوونانی ڕەگەزە مرۆییەکان، ئەوەش تاوانی گەورەیە، پڕپیاکردنی سەرکەوتن بەوە نابێت کەسانێك لە جێگایەك دابنرێن شیاوی ئەو شوێنە نەبنو بانگەشەی ڕێزو پیاهەڵدانی بۆ بکرێتو بەشێوەیەکی کرداری لەو جێگایەدابن. بەڵکە بەدیدێت بە یەکلاییکردنەوەو بەرتەسکردنەوەی سەرکەوتن تەنها لە ڕووی خاوەنەکانیاندا. پرسیارێك شیاوی تێڕامانە ئەوەیە: چۆن ژینگەی کار پاك دەکرێتەوە لەو ڕەگەزانەیی شوێنکەوتەی داڕوخانن لە دامەزراوەکاندا؟ چۆن دامەزراوەکانمان لەو نموونە شێواوانە پاك بکەینەوە کە زیان بە بەرژەوەندی گشتی دەگەیەنن. کە دەبێتە هۆکاری کەڵەکە بوونو مانەوەی هەڵەکان؟



# چەند سەرنجێك بۆ گەیشتن بە ئامانجو بەڕێوەبردنی هەر ڕێکخراوێك

ئا: ئاسۆ سەید لوقمان

١- بۆ کۆکردنەوەی ئەندامانی بەرچاو پێویستە ئەو ڕێکخراوە بە ئاشکراو بێ پێچوپەنا کارکردنی لە پێناو بەرژەوەندی ئەندامەکانی ڕابگەیەنێت.

٢- هۆکارەکانی پەیوەندی بە سەرکردنەوە بەکاربهێنێت، جا چ بە تەلەفۆن، یان ناونیشان، یان لە ڕێگەی ڕاگەیاندن.

٣- ڕاوبۆچوونەکان بە جدی وەربگرێتو وەڵام بداتەوە.

٤- کارەکان بە گوێرەی پسپۆڕی دابەش بکاتو بەشەکانیش لە یەکتری جیا بکاتەوەو بارەگایەکی شیاو، بوونی هۆڵی کۆبوونەوەکان کە زۆر گرنگە.

٥- کە متمانەت پێکرا، یان وەرتگرت ئەوا دەتوانیت ئامانجی ڕێکخراوەکەت بۆ بەرژەوەندی گشتی بەکاربهێنیت، وەك پێشکەشکردنی پرۆژە، کە دەبێتە بارسووکی لە سەر حکومەتو پێشوازییەکی بەرفراوان لە لایەن خەڵکەوە.

٦- کۆبوونەوەی وەرزی، کۆبوونەوەی ناوە ناوە، کۆبوونەوەی پێویست، کە ئەمە نابێتە هۆی دابڕان.

٧- ڕێکخراو، یان ئەندامەکانی دەبێت دووربن لە مشەخۆریو گەندەڵی.

٨- هەر ڕێکخراوێك پێویستی بە بەرپرسێکی بە تواناو بوێرو خۆشەویست هەیە، بەڵام گرنگە ئەو بەرپرسە ئەنجومەنی ڕاوێژکاری هەبێت کە لە پەنجەی دەست تێپەڕ نەکاتو خۆبەخشانە کار بکەن لە پێناو دەرکردنی ناوبانگی ڕێکخراوەکەیان.

٩- پێویستە هەر ڕێکخراوێك بەردەوام بیر لە ئەندامە دەست ڕۆیشتووەکانی نەکاتەوە، بۆئەوەی پەیوەندی لە نێوان ڕێکخراوو خەڵکدا لاواز نەبێت، پێویستە ئەندامی تازە بێنێتە ناو ڕێکخراوەکەوە.

١٠- بەردی بناغەی ڕێکخراو ئەندامەکانییەتی، لە دوای ئەمانە دەزگاکان، لە پێشەوەی هەموویان (ئامار، پلان)ە، بەردەوامیش هەڵسەنگاندن (تقیم).

١١- پەرەسەندنو پێشکەوتنی ڕێکخراو لە ڕێگەی بەکارهێنانی توانای ئەندامەکانی، هەروەها هەمیشە بە کارەکاندا بچیتەوە لە ڕێگەی چاکسازییەوە.

١٢- لە دەستدانی ئەندام، بە ڕێگەی پێویست ڕێی لێ بگیرێت، هەروا بە هەوانتە لە دەستی خۆتی مەدە، چونکە یەکێکە لە بەرهەمەکانی ڕێکخراو.

١٣- بنیاتنان لەسەر بەڵێنو پەیمان: ڕێکخراو تووشی هەرەسهێنان دەکات، ئەمە بۆ ڕێکخراوێکی سیاسی کەلێنێکی گەورەیە، پێویستە خۆتی لێ بپارێزیت.

١٤- ڕێکخراو شوێنی ئامۆژگاریو خوێندنەوە نییە، بەڵکو مەڵبەندی کارکردنە لە پێناو ئامانجێك، یان زیاتر کە ڕێکخراوەکە بە هۆیەوە دروستبووە.

١٥- گلەییو گازندەو پرتەو بۆڵە لە ڕێگەی شەفافییەتو ڕوونکردنەوەوە بنەبڕ دەکرێت.

١٦- هەرکاتێك ڕێکخراو تووشی قەیران هات، ئەوە چارنییە دەبێت بەدوای ڕێگەچارەدا بگەڕێیت، پەنا بردن بۆ دەستنیشانکردنی هەلومەرجی نوێ زۆر پیرۆزە ئەگەر لەسەر حیسابی یەکە یەکەی ئەندامەکانیش بێت، چونکە هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخراو کارەساتە لەسەر هەموو ئەندامو دۆستەکانو بەرژەوەندی سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتیو کەلتووری وڵات.

١٧- هەرکاتێك دەوڵەت ڕێکخراوی لە مردن ڕزگار کرد، ئەوا ئەو ڕێکخراوە دەبێتە ژێردەستی پیاوانی دەسەڵات، بەڵام پێویستە ڕێکخراو هاوکاری دەوڵەت بکات، بە مەرجێك ڕێگە نەدات دەسەڵات دەست لە کاروباری وەربدات، ئەمە زۆر پێوستە بە وردیو وریایی هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت.

١٨- بەرپرسی سەرکەوتوو تر ئەو کەسەیە کە لە پارەو گەندەڵیو ڕابواردن بە دوور بێت.

سەرچاوە:(Business Administration)

و: خوناو محەممەد



# دایناسۆڕێکی ئازا

دەگێڕنـەوە کـەوا دایناسـۆڕێك هێشتا لە ناو باوەشـی دارستانێکی سـەوزدا دەژیاو گژوگیای دەخوارد. ئاژەڵەکانی دانیشتووی دارستانەکەش لەبـەر گەورەیی جەسـتەکەی لێی دەترسـان، بۆیە هیچیان لێی نزیك نەدەبوونەوە.

ئەم دایناسۆڕە تەنها هاوڕێیەکی هەبـوو، ئەویش سـەگێك بـوو، کە هەموو ڕۆژێك هەواڵی دارستانەکەی بۆ دەهێنا.

ڕۆژێکیـان هەوا سـافو بێگەرد بـوو، گشـت ئاژەڵەکان بۆ پیاسـەو ڕابواردنو بـە سـەربردنی کاتێکی خۆش هاتبوونە دەرەوە.

لە ناکاودا هەوا گۆڕاو ڕەشەبایەکی تونـد هەڵـی کـرد، خانووەکانـی تێکشکاندو دارودرەختی لە ڕەگەوە هەڵکێشا.

لەو سـاتەداو کاتێك ئاژەڵەکانی دانیشـتووی دارسـتانەکە خۆیـان حەشاردابوو، دایناسۆڕەکە خەریکبوو هەوڵـی دەدا خانووی دانیشـتووانی دارسـتانو دارودرەختەکانـی لـەم مەترسـییە بپارێزێـت، لەمەشـدا سەرکەوتنی بە دەست هێنا.

لـە بەیانـی ڕۆژی دوایـیدا سەگەکە هەواڵی دایە زۆربەی زۆری دانیشـتووانی دارستانەکە بەوەی کە دایناسـۆڕە هاوڕێیەکەی کردوویەتی لە پێناوی ڕزگارکردنی دارسـتانەکە لـەو مەترسییەی کە هێرشـی بۆ هێنابـوونو بـۆ پارێزگاریکردن لە جوانییەکەی دارستان.

دانیشتووانەکەش سەریان سوڕماو سـەرەتا باوەڕیان پـێ نەکرد، بەڵام لە دواییدا بە چاوی خۆیان بینیانو دڵنیا بوون لە ڕاستی ئەو هەواڵە.

بۆیە هـەر لـەو ڕۆژەوە هەموو ئاژەڵانـی دارسـتانەکە دایناسـۆڕە (ئازاکەیـان) زۆر خۆشدەویسـتو ڕێزیان لێدەگرت.

سـەرچاوە/ گۆڤاری (العربی الصغیر) ژمارە (١٤٩).

# ئاسمان

ئاسۆ حاجی

دەمەو بەیانیان، ڕەش سپی دەبێت
بـە تیشـکی زێـڕیـن،
شـەو ڕوونـاك دەبێت
لـە ڕۆژی ساماڵ، بڕوانە ئاسمان
پاكو بێگەردە، شینێکی جوان
ئێواران کە خۆر ڕەنگی زەرد دەبێت
ئـاسمان بـە چەند ڕەنگ،
ڕەنگاو ڕەنـگ دەبێـت
شـەوانـەش گـەرچی
ڕووخسـاری ڕەشـە
بەڵام بڕوانە ئە ستێرەی گەشە
بیلو، تەرازوو، هەم حەوتەوانە
ڕێی کاکێشانو چەندین لەمانە
دەیرازێننەوە ئاسمانی بەرین
بۆ ئێمەی مرۆڤ تا پێی دڵخۆشبین



# تۆڕو سیستەمی کارتی بانکیی ئەلیکترۆنی

هاشم غەمگین

مەرجی کارایی خزمەتگوزاریی تۆڕو سیستەمی کارتی بانکی:

تۆڕی کارتی بانکی وەك شەبەكەی سیم كارتی مۆبایل فراوانو جۆراو جۆرن، هەریەکەیان خەسڵەتو تایبەتمەندییو خزمەتگوزاریی خۆی هەیە، کێبەڕکێو هەوڵدانیش لە نێوان بانکەکاندا هەیە لە پێشکەشکردنو گەیاندنی خزمەتگوزاریی باشتر بە بەشداربوو.

بەشێوەیەکی گشتی ئەو تۆڕی بانکییانەی لە وڵاتە ئەورووپییەکان بەشداربوویەکی ڕەهاو خەڵکێکی زۆر بەکاریدەهێنێت، ئەم مەرجو خزمەتگوزارییانەی تێدایە:

یەکەم: سیستمی ئەکتیڤو خێرایە لە گواستنەوەی پارە بۆ سەر ژمێریاری بەشداربووان.

دووەم: بەشداربوو لە ڕێی تۆڕی ئینتەرنێتەوە، دەتوانێت تەماشای ژمێریاری کارتی بانکەکەی بکاتو زانیاریو ئاگایی هەیە لە بارەی چەندێتی هەبوونی پارەو چۆنییەتی خەرجکردنو ڕاکێشانی، لە چ فرۆشگەو وێستگەی ئامێرێکی بانکی، هەروەها لە چ ڕۆژو کاتو شوێنێك، لەگەڵ ئەوەشدا بەشداربوو دەتوانێت سەردانی بنکەکان بکاتو لە ڕێی ئامێری تایبەت بۆ ئەو مەبەستە بە دەستی خۆی پارەبخاتە سەر کارتەکەی. پاشان زۆر لە تۆڕی بانکەکان پەیوەندییو تۆڕیان بە یەکەوە بەستراوە، بەشداربووان دەتوانن لە وێستگەی ئامێرەکانی یەکدی، بە کارتەکانیان پارە ڕابکێشن.

سێیەم: بەشداربووان دەتوانن لە نێوان خۆیاندا بە کارتی بانکەکانیان لە ڕێی تۆڕی ئینتەرنێتەوە لەهەر شوێنێکدا بن لە ماوەی یەك خولەکدا پارە بگوازنەوە سەر ژمێریاری یەکدی.

چوارەم: تۆڕی بانکەکان لەسەرجەم شارو شارۆچکەو گوندەکاندا، لەو شوێنانەی پێویستن‌و لە نێو بازاڕەکاندا، وێستگەی ئامێری بانکی هەیە، بۆ ڕاکێشانی پارە، لەگەڵ بنکەی زانیاریی بانکی بۆ گوێگرتنو چارەسەرکردنی هەبوونی هەر داواکاریو گرفتێك کە بەشداربووان هەیان بێت.

پێنجەم: تۆڕی بانکەکان سیستەمو پەیوەندییان بە فرۆشگەو مارکێتو هۆتێلو ڕێستۆرانتەکانو... هتد، بەستووەتەوە لە ڕێی دابینکردنی ئامێری بانکەکانو دانانی لای کاسەکان، بۆ ئەوەی هاوڵاتییان لە کاتی کرینی پێداویستییەکانیان لە ڕێی کارتی بانکەکانیانەوە، پارەی شتومەکەکانیان بدەن..

شەشەم: بەشێوەیەکی مانگانە لە بنکەی تۆڕی بانکەکانەوە پەرتوکی زانیارییو خشتەی چۆنییەتی سەرفکردنی پارە بە بەشداربوو ڕادەگەیەنرێتو دەگات، هەروەها بەشداربوو لای خۆی دۆسییەی دروستکردووە بۆ ئاگاییو هەڵگرتنی.

حەوتەم: لە بانکەکاندا زەمانەتی تەواوی پارەی بەشدار بوو دەکرێت لە مانەوەو فەوتاندن.

شەبەکەو سیستمی بانکی لە ناوچەیەکدا سەرکەوتوو دەست بە کارو جێگیرو بەشداربووی دەبێت کە:

**یەکەم:** ئاسایشو ئارامی بە باشی سەقامگیرو فەراهەم بێت.

**دووەم:** متمانەو دڵنیایی لە نێوان حکومەتو هاوڵاتیاندا بەرجەستە بێت.

**سێیەم:** سیستمێکی کاراو ئەکتیف بێتو پێگەیەکی بەربڵاوو فراونو خزمەتگوزاریی باشو پێویستی بۆ بەشداربووان هەبێت.

**چوارەم:** ئای دی کارتو داتاو ئەدرەسو ناونیشانی کەسێتی بەشدار بوو لە سیستمی کۆمپیوتەریی دامەزراوەکاندا دروستو جێگیربێت.

بە گشتی سوودی بەشداربوون لە تۆڕی کارتی بانکی، بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە:

**یەکەم:** هاوڵاتی بۆ پێدانەوەی قەرزو پێشینەو غەرامەو باجی.... (ئاو، کارەبا، خانوو، دوکان، دڵنیایی تەندروستیو تەلەفۆنو... هتد. چیتر پێویستی بەوە نابێت بە پێی خۆی سەردانی دامەزراوە حکومیو ئەهلییەکان بکاتو ماندوو بێت، بەڵکو مانگانە بڕی دیاریکراوی پێدانەوەی پارەی باجو قەرزەکان، چەند لە ئەستۆی بێت، ڕاستەوخۆ لە ژمێریاری کارتی بانکەکەی دەبڕدرێت.

**دووەم:**دامەزراوە حکومیو ئەهلییەکان دابەشکردنی مووچەی مانگانەی فەرمانبەرانو خانەنشینو پۆلیسو سەربازو کرێکارو... هتد، وەرگرتنی بە دەستیی نابێت تاوەکو پاڵە پەستۆو قەرەباڵغیو گازندەو توانج لەسەر دامودەزگاکان دروست ببێت، بەڵکو هەر کەسە، بڕی مووچەی دیاریکراوی مانگانەی خۆی چەند بێت، لە کاتی خۆی بۆی دەخرێتە سەر ژمێریاری کارتی بانکەکەی.

**سێیەم:**هەربەشداربوویەکی سیستمو تۆڕی بانکی ناوی خۆی لەسەر کارتەکەی نوسراوەو ژمارەی ژمێرياریيو کۆدی نهێنیی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ گواستنەوەو داخلکردنی پارەو بۆ تەماشکردنو ڕاکێشانی، جگە لە خۆی هیچ کەسێکی دیکە بە ژمارەی نهێنی کارتەکەی نازانێت.

**چوارەم:** ئەوانەی خەریکی کاری بازرگانیو خاوەن کۆمپانیای جۆراوجۆرن، یان خاوەن پارەی نووستون لەماڵەوە، لە بەشداربوون لە تۆڕوسیستمی کارتی بانکیدا، سودو قازانجی زۆر دەکەن، بەوەی لە ترسو دڵەڕاوکێی دوورکەوتنەوە لە ماڵەوەو لە مەترسی هێرشی باندی دزیو جەردەیی قوتاردەبنو دڵنیادەبن لە پاراستنو مانەوەی پارەکانیان، لەگەڵ ئەوەشدا کارئاسانی تەواو دەکات لە بەڕێوەچوونو ڕاییکردنی کارەکانیاندا.

**پێنجەم:** هەر کاتێك هاوڵاتی پێویستی بە پێشینەو قەرز هەبێت، دەتوانێت داواکاریی پێشکەش بکاتو بە لێکدانەوەو بە پێی داهاتو مووچەو جۆری پیشەکەی قەرزو سلفە لە بانکەکان وەربگرێت.

هەر تاکێك هاوڵاتیو دانیشتووی هەر وڵاتێك بوو، مافی ئەوەی هەیە بە یاسایی کار بۆ بەشداریکردنو وەرگرتنی کارتی تۆڕی بانکی بکات بەم شێوەو مەرجانەی لای خوارەوە:

**یەکەم:** هاوڵاتی بۆ بەشداربوون دەبێت سەردانی بنکەی بانکەکان بکاتو فۆرمی زانیاری وەربگرێتو زانیاری کەسێتییو ئەدرەسو ناونیشانو وەزیفەو کارو پیشەی خۆی بە دروستی تۆمار بکات.

**دووەم:** دۆکێومێنتی کەسێتی، کە وێنەی خۆی لەسەر بێت تەسلیم بکات.

**سێیەم:** بۆ وەرگرتنی زانیاریی ڕیکلامی کاری بانکەکان بە هاوڵاتی دەدرێت.

**چوارەم:** دوای دوو هەفتە لە ڕێی پۆست، یان پەیوەندیکردنەوە، هاوڵاتی ئاگادار دەکرێتەوە لە وەرگرتنی کارتی بانکییەکەی.

**پێنجەم:** بۆ وەرگرتنی کارتەکە سەرەتا بڕێکی کەم پارە لە بەشدار بوو وەردەگیرێت، دواتر بەشێوەیەکی مانگانە، یان وەرزییانە دەبێت، ئەگەر بڕەکەی بە پارەی خۆمان بەراورد بکرێت بۆ مانگێك، دەکاتە (١٥٠٠) دینار.

**یەکەم:** دەبێت بەشدار بوو کۆدی نهێنیو ژمارەی ژمێریاری کارتەکەی فەراموش نەکاتو لە بیری بێت، پاشان لە وێستگەی ئامێری بانکەکاندا، ئاگاداربێت لە کاتی بەکارهێنانو ڕاکێشانی پارە، بە هەڵە کۆدەکە لێنەدات، چونکە ئەگەر بە هەڵە کۆدەکەی تۆمارکرد، کارتی بانکەکەی دەسووتێت، دواتر بۆ وەرگرتنی کارتێکی دیکە دەبێت سەردانی یەکێك لە بنکەی بانکەکان بکات، لەگەڵ ئەوەشدا حسابی پارەی سەرکارتەکەی وەك خۆی دەبێتو نافەوتێت.

**دووەم:** بەشداربوو بۆ سەلامەتیو پاراستنی داهاتو سامانی، نابێت ژمارەی نهێنی کارتەکەی لای هیچ کەسێك بدرکێنێت، پێویستە لە لای خۆی پارێزراو بێت.

**سێیەم:** ئەگەر هاتوو بەشداربوو کارتەکەی لێ ون بوو، یان لێی برا، دەبێت دەستبەجێ بنکەی تۆڕی بانك ئاگادار بکاتەوە، بۆئەوەی خێرا بسووتێنرێت. دەرفەتی بەکارهێنانی نەبێت.

**چوارەم:** بەشدار بوو نابێت بێ زانیاریو وەرگرتنی ڕێنمایی کارتەکەی بەکار بهێنێت، دەبێت سەردانی یەکێك لە بنکەی بانکەکان بکات بۆ ئەوەی لای کارمەندان، لە مەڕ چۆنییەتی بەکارهێنانو پەیداکردنی شارەزایی، زانیاریو ڕێنمایی پێویستی پێ ببەخشرێت.

**پێنجەم:** بەشداربوو لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا بۆ ڕاکێشانی پارە لە وێستگەی ئامێریی بانکەکان بۆی هەیە تەنها بڕی (٥٠٠) یۆرۆ ڕابکێشێت، بۆ ڕاکێشانی پارەی زیاتر دەبێت سەردانی بنکەی بانکەکان بکات، پاشان دەبێت پاسپۆرت، یان ئای دی کارتی خۆی پێ بێت، دیارە ئەمەش بۆ ئەوەیە ئەگەر هاتوو بەشداربوو کارتی بانکییەکەی لێ ونبوو، یان لێی برا، فریای ئاگادارکردنەوەی بنکەی بانكو سووتاندنی کارتەکەی بکەوێت، یان کەسێکی دیکە نەتوانێت مامەڵە بە کارتی بانکی کەسێکی دیکەوە بکات.

**شەشەم:** لە کاتی بوونی قەرەباڵغی لەسەر وێستگەی ئامێری بانکەکان، دەبێت ڕیز بگیرێتو نۆرە بڕی نەکرێت، ئەو کەسەشی لای ئامێرەکەیەو خەریکی ڕاکێشانیی پارەیە، نابێت کەسی پاش خۆی لێی نزیك ببێتەوە، دەبێت لانی کەم چوار مەتر لێوەی دوور بێت.



# چیرۆکی دەوڵەمەندترین مرۆڤی سەدەی بیست و یەك (بیڵ گەیتس)

ئا/ کۆمپیوتەرو مۆبایلی کازیوە - بازاڕی بەرهەم

کۆمپانیـــای مایکرۆســۆفت بـــوو بــە خاوەنی (١٠٠) بلیۆن دۆلاری ئەمریکی لەسەر دەســتی دامەزرێنەرێکی ســەدەی بیســتەم بــە ناوی (بێڵ گەیتــس)ەوە، کە گەورەترین ئابوری لــە جیهاندا بەرهەمهێنا، ئێســتا لە جیهانــدا نزیکەی یــەك ملیــار کۆمپیوتەر بــە کاردەهێنرێت، بە پێــی تازەترین ئامار دارایی کۆمپانیای مایکرۆســۆفت لەســەروی (٢٠٠) بلیــۆن دۆلارەوەیە، هەموو ئەم داراییە دەگەڕێتەوە بۆ توانای داهێنان لە لایەن (بێڵ گەیتس)و هاوڕێکانییەوە.

(بێــڵ گەیتس) کاتی خۆی لــە منداڵیدا ئــەم وتەیەی بەکارهێنــاوە (دەتوانم هەموو شــتێك بکــەم ئەگــەر بیروهۆشــم تــەواو بخەمە ســەر ئــەوکارە)، بــۆ یەکەمجار کە تەمەنی دەگاتە (١٤) ســاڵان هەڵدەســتێت بە دامەزراندنــی کۆمپانیایەکــی (پرۆگرامــی)، (بێڵ گەیتس) زۆر بە توانا بووە لە زانســت و بیرکاریدا، هەر لەسەرەتاوە کەسوکارەکەی هەســتیان بەمە کردووە، بۆیــە لە قۆناغی ناوەنــدی ڕەوانەی قوتابخانەی (لیك ســاید) بۆئەوەی توانــای هونەریی زۆر بەرزبێتەوە، لــەو قوتابخانەیــەدا لەســاڵی ١٩٦٨ بڕیاردرا بــە کڕینی ئامێرێکــی کۆمپیوتەر، هەر ئەو کۆمپیوتەرە بوو بە هۆی گۆڕینی ئاڕاســتەی ژیانــی (بێڵ گەیتس)، ئەو هاوڕێیانەی زیاتر خولیــای کۆمپیوتەر بــوون، (کانت ئیڤانس، بول ئالن) بوون، بول ئالن لە تەمەندا ٢ســاڵ لە (بێڵ گەیتــس) گەورەتربوو، هەردووکیان کۆمپانیــای مایکرۆســۆفتیان دامەزراند، لە ســاڵی ١٩٧٦ دوای دامەزراندنــی کۆمپانیــای پرۆگرامەکانی، چەنــد پرۆگرامێکی یاری و چەنــد پرۆگرامێکی کورتی دانا، ئەو کات بە زمانی (بەیسك) دەینوسییەوە.

لە ساڵی ١٩٦٩ (بێڵ گەیتس)و (بول ئالن) کۆمپانیایەکی تایبەتیــان دامەزراند بەناوی کۆمەڵەی پرۆگرامی (لیك ساید کۆمپیوتەر)، پاشان هەردووکیان هەستان بە دامەزراندنی دامەزراوەیەك بە ناوی (Traf_O_Data) بۆ فرۆشتنی کۆمپیوتەری بچووك کە دەیتوانی ئەو کاتە ڕێگاکانی هاتوچۆ ئاسان بکات لەناو وڵاتــە یەکگرتووەکانــی ئەمەریــکادا، بۆیە قازانجێکی زۆریــان بەرهەمهێنا، هەرچەندە لەســەرەتاوە کڕیارێکــی وای نەبــووە، بەڵام سەرەنجام قازانجی زۆری بووە.

پاش ئەوەی کە قوتابخانەی دواناوەندی تــەواو کرد (بێڵ گەیتــس) بڕیاری دا بچێتە بەناوبانگتریــن و باشــترین زانکــۆی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریــکا، ئەویش زانکۆی (هــارد ڤارد)، بە ئەنجامیشــی گەیاند، بەڵام زۆر ســەرکەوتوو نەبــوو لە زانکــۆی (هارد ڤارد)، چونکە لە بەشــی بیرکاریدا لاوازبوو، بۆیە بڕیاری دا سەرەتای ژیانێکی نوێدەست پێ بکات، پاش ئەوەی کە لە کانونی یەکەمی ١٩٧٤ کە پەیوەندی بــە برادەرەکەیەوە (بول ئالــن) کرد کــە ســەردانی بــکات، بینی بە دەستی برادەرەکەیەوە گۆڤارێك بەنــاوی (Popular Electronics)وە لــە بەرگی گۆڤارەکەدا وێنەی کۆمپیوتەرێکی شــەخصی تێدابوو، بە ناوی (Altair 8800) ئەمانیش هەستیان بەوەکرد کۆمپیوتەر دەبێت بە زمانی داهاتــووی خەڵك، بۆیە بیریان لەوە کردەوە چۆن سیســتەم بۆ کۆمپیوتەر دروست بکەن، بۆیە دوای ئەوە هەردووکیــان پەیوەندییان کــرد بە کۆمپانیای کۆمپیوتەرەکەوە بەناوی کۆمپانیــای (MITS)، خاوەنــی کۆمپانیاکە داوای لێکردن پرۆگرامێکی ئاســان دروســت بکەن بۆ کۆمپیوتەر، هەردووکیان لەماوەی ٨ هەشت هەفتەدا پرۆگرامێکیان بۆ دروستکرد لە زمانی (Basic)، یاخود (Roberts) ئەو پرۆگرامە زۆر سەرکەوتوو دەرچوو، ئەمەش بــوو بە خاڵــی وەرچەرخان لــە ژیانی ئەو دوانەدا، ئەم پرۆگرامانە بوو بە هۆی هاتنە کایەی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت.

دروشــمی دامەزرێنەرەکانــی کۆمپانیای مایکرۆســۆفت ئەمانــە بــوون؛ (کاربکــەو هەوڵبدە، بەرهەمەکانــت زیادبکە، بۆئەوەی ســوودبەخش بیــت)، هــەر لەســەرەتاوە شــەووڕۆژیان خستبووە ســەریەك و کاریان دەکرد بۆ سەرخستنی ئەم کۆمپانیایە، ساڵی ١٩٧٥ دامەزراندنی کۆمپانیای مایکرۆســۆفت بوو، تەمەنی بەڕێوەبەری جێبەجێکار (بێڵ گەیتس) (٢١)ساڵ بووە لە کاتی دامەزراندندا،

## كتێبی

## (نهێنییەكانی سەركەوتن لە خوێندندا)

## كەوتە بەردیدی خوێنەران




خوێندكاری بەڕێز:

دەمەوێت لەم نووسینەدا چەند ئامۆژگاریی‌و ڕێنماییەك ئاڕاستەی تۆی ئازیز بكەم سەبارەت بە باشترین ڕێگەو نەریتو شێوازی كۆششكردن‌و خوێندن، تاكو ڕۆژانی سەختو دژوارو پڕ لە ناڕەحەتی قۆناغەكانی خوێندن‌و تاقیكردنەوەكان بە ئاسانی بەسەرتدا گوزەر بكەن‌و بتوانیت تێیاندا سەركەوتن بەدەست بێنیتو بەئاكامی بەرزی خۆت بگەیت.

بۆیە كاتێك كە یەكەم سكرتێر بە ناوی (میریان لۆبر) دەبێت بە سكرتێر بە تەمەن زۆر گەورەتر بووە لە (بێڵ گەیتس)، ڕۆژێك پەیوەندی دەكات بە یەكێك لەوانەی كە ڕاهێنەرن لە كۆمپانیاداو دەڵێت منداڵێك هاتووەتە ژوورەكەم گەمە بە كۆمپیوتەر دەكات، چونكە پێشتر (بێڵ گەیتس)ی نەبینیبوو كە بەڕێوەبەرە، ئەو منداڵە (بێڵ گەیتس) خۆی بوو! دواتر (بێڵ گەیتس)و (بۆل ئالن) بڕیاریاندا نوسینگەی سەرەكی بگوێزنەوە بۆ شوێنێكی سەرەكی بۆئەوەی زیاتر پەرە بەكارەكەیان بدەن، (بێڵ گەیتس) شەووڕۆژ كاری دەكردو تەنها پیتزای (سارد)ی دەخوارد، ئەو كات ژمارەی فەرمانبەرانی كۆمپانیا ١٣ فەرمانبەر بوو، خاوەنی (یەك ملیۆن) دۆلار بوون.

(بێڵ گەیتس) زۆر بە توندوتیژی مامەڵەی لەگەڵ فەرمانبەرەكانیان كردووەو هاواری كردووە بەسەریاندا بۆ ئەوەی زیاتر هەوڵبدەن ئەنجامی باشیان هەبێت، (بێڵ گەیتس) هاوسەرگیری لەگەڵ (میلندا فرنسیۆ دالاس)دا كردووە، لە ١٩٩٤/١/١، خاوەنی سێ منداڵن بە ناوەكانی: (جینیفر -١٩٩٦) (كاسرین -١٩٩٩) (جایتس- ٢٠٠٢).

گەورەترین كۆشكی هەیە كە بەسەر دەریاچەی واشنتۆن لە پایتەختی ولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكادا دەڕوانێت، لە ساڵی ٢٠٠٢ نرخەكەی گەیشتە ١١٣ ملیۆن دۆلار، هەربۆیە باجەكەی ساڵانە (یەك ملیۆن) دۆلارە، كۆمەڵێك كتێبی تایبەتی كڕیووە بۆ خوێندنەوە كە نرخەكەی دەگاتە (٣٠ ملیۆن) دۆلار، لە تەمەنی ٣٠ ساڵیدا بە(ملیۆنەر) ناسراوە، لە ٣١ ساڵیشدا بە (بلیۆنەر) ناسراوە.

ئێستا یەكێكە لە هەرە دەوڵەمەندەكانی جیهان، بڕیاری داوە سامانەكەی ببەخشێتەوە لە پێناو كاری چاكەدا. بەخشینی بەسەر هەژاران و منداڵانی بێباوك و...هتد، بە گوێرەی هەواڵی cnn سەرمایەكەی ((٥٧)) ملیارە، بەشێك لەو سەرمایەی داناوە بۆ هەر سێ منداڵەكەی.

ئەمە ژیانی ئەو مرۆڤە بوو كە توانی بواری ئابووری دروست بكات لە جیهاندا، كە مەزەندە دەكرێت بە (یەك ملیار) كۆمپیوتەر لەسەر سیستەمی كۆمپانیای مایكرۆسۆفت فرۆشرابێت، ئێستاش گەورەترین بواری داراییە لەجیهاندا، پێویستە مرۆڤ بیركردنەوەكانی بەو شێوەیە بێت لە بواری ئابوریدا، هەروەها دەبێت كۆتاییەكەشی هەر ئابوورییانە بێت و سامانەكەی ببەخشێتەوە لە پێناوی مرۆڤایەتیدا. بۆ زانیاریت ئێستا كۆمپانیای مایكرۆسۆفت خاوەنی ٨٩٠٠٠ فەرمانبەرە.



# ئاكارو خووی مرۆڤە سەركەوتووەكان لە ٤٠ خاڵدا

و: م.ڕێباز ئەحمەد

هەر لە ئەمڕۆوە لەگەڵ ئاكارو خووە خراپەكانی خۆتان ماڵئاوایی بكەنو لە ئاكارە باشەكانی مرۆڤە سەركەوتووەكان سڵاو بكەن.

(كرایگ هایپەر)ی نوسەر، لێكۆڵەر، بێژەری ڕادیۆو تەلەفزیۆنو وتەبێژێكی سەركەوتووە، لە ٢٥ ساڵی ڕابردوودا بە كارەكانی وەك كارزانێكی لێزانو سەركەوتوو لە لایەنی كەسایەتیو كۆمەڵایەتییەوە ناسراوە. (هایپەر) سایتێكی لە بارەی وتەبێژی كاریگەر هەیە كە لەوێدا نووسیویەتی: (من ویستوومە بەشە گرنگەكانی ئەو كتێبانەی كە تا ئێستا خوێندومەتەوەو پارەمتیان داوەو ئەو تاقیكردنەوانەی كە لە ژیانمدا بە دەستم هێناوە بە شێوەی ٤٠ خاڵ كۆبكەمەوەو بیخەمە بەر دیدی ئێوەی ئازیز، تاوەكو لە هەر ساتو كاتێكدا بتوانن بیخوێننەوە. بە دڵنیاییەوە ئەو كتێبانەی كە لە ئاستی جیهانیدا خاوەن فرۆشێكی ناوازەن لە بارەی پارمەتیدانی خۆت، دەگونجێت كەسانێك سوودیان لێ وەرگرتبێت، بەڵام من دەمەوێت شتێك بنووسم كە بۆ هەموو كەس بەسوود بێت)، ئێستاش بفەرموون بۆ خوێندنەوەی (٤٠) ئامۆژگارییەكەی كرایگ هایپەر لە كۆتاییدا خۆتان بڕیار بدەن.

١- سەركەوتووەكان هەڵێك دەبیننو دەدۆزنەوە كە كەسانی تر نایبینن.

٢- لە كێشەكان پەند وەردەگرن، لە حاڵێكدا كە كەسانی تر تەنها كێشەكان دەبینن.

٣- سەرنج دەدەنە ڕێگە چارەكان.

٤- لەو ساتو كاتەی كە كەسانی تر ئارەزوو دەكەن سەركەوتن بەدەستبهێنن، هۆشیارانەو لەسەر زانینی شێوە دروستەكان سەركەوتنیان بونیاد دەنێن.

٥- هەروەك كەسانی تر (ترس)یان هەیە، بەڵام ناهێڵن (ترس)ەكان كۆنترۆڵو دەست بەسەرویان بكەن.

٦ـ پرسیاری دروستو گونجاو لە خۆیان دەپرسن. ئەو پرسیارانەی كە دەیانخاتە سەر ڕێگەی دروستی بیركردنەوەی مێشكیو ڕۆحی.

٧ـ زۆر بە كەمی سكاڵاو گلەیی لە شتێك دەكەنو وزەی خۆیان بەو هۆیەوە لە دەست نادەن. هەر شتێك ببێتە هۆی سكاڵا كردن تەنها كەسەكە دەخاتە سەر ڕێی بیركردنەوەی خراپو بێ سوود.

٨ـ هیچ كات سەرزەنشت ناكەن، نە خۆیانو نە كەسانی دی، (بە ڕاستی سوودەكەی چییە؟) ئەوان بەرپرسیارێتی تەواوی كارەكانیانو ئەنجامەكانیان لە ئەستۆ دەگرن.

٩ـ كاتێك كە ناچارن توانایەك زیاد لە پێویستی توانایان بەكاربهێنن، ڕێگەیەك بۆ بەرزكردنەوەی تواناكانیان دەدۆزنەوەو زیاد لە توانایان لە خۆیان داوا دەكەن. ئەوان لەو شتەی كە هەیانە بەشێوەیەكی كاراتر كەڵك وەردەگرن.

١٠ـ هەموو كات ئیشكەر، چالاكو بونیاد نەرن. كاتێك كە زۆربەی خەڵك پشوو دەدەن ئەوان بەرنامە دادەڕێژنو

بیر دەکەنەوە لەبەرئەوەی کاتێك کە کارەکانیان ئەنجام دەدەن دڵەڕاوکێی کەمتریان هەبێت.

١١- خۆیان لەگەڵ کەسانێك کە هاوفیکرو بیرکردنەوەیان وەك یەکە دەگونجێنن. ئەوان گرنگیو نرخی گروپو بە یەکەوە بوون دەزانن.

١٢- بیرکردنەوەیان بەرزەو حەزدەکەن کەسێکی سەرسوڕهێنەر بن. ئەوان هۆشیارانە هەڵدەبژێرن تاوەکو باشترین جۆری ژیانیان هەبێتو ناهێڵن ژیانیان بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیك تێپەڕێت.

١٣- بە دڵنیاییو ئاشکرا دەزانن چییان لە ژیان دەوێتو چییان ناوێت. ئەوان باشترین ڕاستی بە دروستی بۆ خۆیان وێنا دەکێشن لە جێگەی ئەوەی بە تەنها تەماشاگەری ژیان بن.

١٤- زیاتر لەوەی کە لاسایی بکەنەوە، داهێنان دەکەن.

١٥- بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان ئەمڕۆو سبەی ناکەنو ژیانیان لە چاوەڕوانی گەیشتنی باشترین کات بۆ ئەنجامدانی کارێك لە دەست نادەن.

١٦- ئەوان فێرخوازی قوتابخانەی ژیاننو هەموو کات بۆ فێربوونی خۆیان کاردەکەن. ئەوان لە ڕێگەی جیاوازەوە وەك: فێربوونی خوێندن، بینینو بیستن، پرسیار کردن، خوێندنەوەو تاقیکردنەوە (ساردو گەرمی ژیان) فێر دەبن.

١٧- هەموو کات نیوە پڕەکەی پەرداخ دەبیننو توانای دۆزینەوەی ڕێگە چارەی گونجاویان هەیە.

١٨- بە ئاشکرا دەزانن کە دەبێت چ کارێك ئەنجام بدەنو ژیانیان بە فڕین لە لقێکەوە بۆ لقێکی تر لە دەست نادەن.

١٩- سەرکەشییەك دەکەن کە لە پێشدا حسابیان بۆ کردبێت: چ دارایی بێت، یان هەستیو پیشەیی.

٢٠- بە خێرایی کاریگەر بەرەنگاری ئەو کێشەو سەختیانە دەبنەوە کە بۆیان پێش دێتو هیچ کات لە بەرامبەر کێشەکاندا سەریان ناکەن بە ژێر بەفرەوە. بەرەنگاری سەختیو کێشەکان دەبنەوەو بۆ پێشکەوتنی خۆیان سوودیان لێ وەردەگرن.

٢١- چاوەڕێی قسمەتو چارەنووسو شانس نین، بۆئەوەی داهاتویان دیاری بکات. ئەوان باوەڕیان وایە کە بە هەوڵدانو چالاکی، باشترین ژیان بۆخۆیان دروست دەکەن.

٢٢- کاتێك کە زۆربەی خەڵك کار ناکەن، ئەوان خەریکی چالاکین. ئەوان پێش ئەوەی ناچار بە ئەنجامدانی کارێك بن بە کردەوە ئەنجامی دەدەن.

٢٣- زیاتر لە کەسانی ئاسایی هەستەکانیان کۆنترۆڵ دەکەن. ئەوان هەمان هەستیان هەیە کە کەسانی دی هەیانە، بەڵام هیچ کات نابنە کۆیلەی هەستەکانیان.

٢٤- زۆر بە باشی پەیوەندی دروست دەکەنو لەسەر پەیوەندییەکان کاردەکەن.

٢٥- بۆ ژیانیان پرۆگرامو بەرنامەیان هەیەو هەوڵدەدەن کار بە بەرنامەکانیان بکەن. ژیانیان لە ئەنجامدانی کاری بێ بەرنامەو ئەنجامی لە ناکاو خاڵییە.

٢٦- لە کاتێکدا کە زۆربەی خەڵك بەهەر نرخێك دەیانەوێت تووشی سەختی نەبنو لە سەختیو کێشەکان خۆیان دوور دەگرن، کەسانی سەرکەوتوو نرخو بەهای کارکردنو ئامادە بوون لە تەواوی سەختیو کێشەکان تێدەگەن.

٢٧- نرخو بەهای ژیانیان دیاریکراو نییەو ژیانیان لەسەر هەمان نرخو بەها بونیاد دەنێن.

٢٨- هاوسەنگییان هەیە. کاتێك کە لە لایەنی داراییەوە سەرکەوتوون، دەزانن کە پارەو سەرکەوتن هاوتای یەکتر نین. ئەوان دەزانن کەسانێك کە تەنها لە لایەنی داراییەوە لە ئاستێکی باشدان، سەرکەوتوو نین. ئەمە لە حاڵێکدایە کە زۆربەی خەڵك وابیردەکەنەوە کە پارەو سامان هەمان سەرکەوتنە، بەڵام ئەوان تێگەیشتوون کە پارەوسامان وەك شتەکانی دیکە هۆکارێکە بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن.

٢٩- گرنگی کۆنترۆڵ لەسەر خۆیان هەست پێدەکەن. ئەوان بەهێزن لەوەی کە بە ڕێگایەکدا دەڕۆن کە کەمتر کەسێك دەتوانێت بڕوات هەست بە خۆشی دەکەن.

٣٠- دڵنیان لە خۆیانو بە هەستەکانی وەك: (لە کوێدا ژیان ئەنجام دەدەنو چییان هەیەو چۆن دێنە بەرچاوو گرنگی نادەن).

٣١- دەستو دڵ کراوەو میهرەبانو لەوەی کە یارمەتی کەسانی تر دەدەن بۆ گەیشتن بە داواکانیان خۆشحاڵن.

٣٢- لێبوردنو هەڵەکانیان بە خۆشحاڵییەوە قبوڵ دەکەنو بە ئاسانی داوای لێبوردن دەکەن. ئەوان لە تواناکانیان دڵنیان، بەڵام لوتبەرزو لەخۆبایی نین. خۆشحاڵ دەبن کە لە کەسانی ترەوە فێربنو لەوەی کە هاوکاری خەڵك دەکەن بۆ ئەوەی باش بێنە بەرچاوو زیاتر لە سەرکەوتنی خۆیان چێژی لێ وەردەگرن.

٣٣- بە نەرمی دەجوڵێنەوەو گۆڕان بە هەل دەژمێرن. کاتێك کە هەلو مەرجێك دێتە پێشەوە کە ئاکارو ئاسایشی ڕۆژانەیان تێك دەدات بە باوەشی کراوەوە پێشوازی لەو شێوازە نوێو نەناسراوە دەکەن.

٣٤- هەموو کات تەندروستی جەستەیی خۆیان لە هەلو مەرجێکی جێگیردا ڕادەگرن. دەزانن کە جەستەیان ماڵێکە کە لەوێدا دەژین، لەبەرئەوە تەندروستی جەستەیی بە لایانەوە زۆر گرنگە.

٣٥- ئیرادەیەکی گەورەو بەهێزیان هەیە. بە سەختی کاردەکەنو تەممەڵی ناکەن.

٣٦- هەموو کات چاوەڕێی کاری گەورەو باشن کە ئەنجامی بدەن.

٣٧- لەگەڵ خەڵکی خراپو دەروون پیس دانانیشن.

٣٨- کاتەکانیانو وزەکانیان لەو بوارانەی کە دوورە لە کۆنترۆڵیان بەکار ناهێنن.

٣٩- پلاکی داگیرسانو کوژانەوەیان هەیە. دەزانن چۆن پشوو بدەنو بحەسێنەوە. لە ژیانیان چێژ وەردەگرنو سەرگەرمی کاری خۆیانن.

٤٠- لەسەر زانیارییەکانیان ڕاهێنان ئەنجام دەدەن. لە بارەی بابەتە سەرسوڕهێنەرو ئاڵۆزەکان خەیاڵ نایانباتەوە، بەڵکو ژیرانە بەردەوام دەبن لە ژیان.



## لێکۆڵینەوەیەکی زانستی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە

# بیرکردنەوە بە بێدەنگی.. کلیلی داهێنانە

و: سەروەر جەبار

- لێکۆڵەرەوەیەکی هۆڵەندی جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەوانەی بە بێدەنگی، بۆ چەند خولەکێکی دیاریکراو لە کۆبوونەوەکاندا لەگەڵ کەسانی دیکەدا بیر دەکەنەوە، هەر توانایان زیاد ناکات لەسەر قاڵبوونەوە، بەڵکو بیریان بۆ بیرۆکەی نوێ فراوانتر دەکات، کە یارمەتییان دەدات بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان.

"ئەرنی دۆفیت" لە زانکۆی تیلبۆرگ.. بۆ رۆژنامەی "القبس" گوتی: بیرکردنەوە بە بێدەنگی بۆ چەند خولەکێک.. دوو هێندە ژمارەی بیرۆکەی نوێ زیاد دەکات.. هەروەها لە گفتوگۆکاندا یارمەتی قاڵبوونەوە دەدات.

"دۆفیت" ئەو لایەنانەشی روون کردەوە کە پەیوەندییان بە پەیپێبردنو لایەنەکانی دەروونیو کۆمەڵایەتی هەبوو، بۆ زۆرێک لەو کەسانەی کە لە ماوەی چل ساڵی رابردوودا کۆی کردووەتەوە.. پاشان لە چوار لێکۆڵینەوەدا ئامادەی کردووەو پاراستوویەتی.. سەرەنجام بۆی دەرکەوت کە گفتوگۆکردنو بیرکردنەوە لە میانەی کۆبوونەوەکاندا لە هەمان کاتدا توانای هەندێک کەس بۆ وردبوونەوەو داهێنان کەم دەکاتەوە.

هەروەها گوتیشی: کە ئەرکە هەمەجەشنەکانی وەک بیرکردنەوەو گفتوگۆ لە یەک کاتدا.. مێشک ماندوو دەکات.. چونکە پێویستی بە خەرجکردنی توانایەکە کە لە توانای خۆی سەروترە.. لەوانەیە کاردانەوەکەشی نەرێنی بێت.. بە تایبەت بۆ ئەو کەسانەی لە بەرامبەر بیروڕای کەسانی دیکە دەشێوێن.

ئاماژەشی بەوە کردووە کە بە بێدەنگی بیرکردنەوە بۆ ماوەی پێنج خولەک لە کۆبوونەوەیەکی ٤٥ خولەکیدا ئاستی بیرۆکەی نوێ بۆ ئامادەبووانی کۆبوونەوەکان، بۆ دوو هێندە بەرز دەکاتەوەو یارمەتی بەدیهێنانی ئامانجەکانیش دەدات.

### رابمێنە.. تا ژیرانە بیر بکەیتەوە

زانایانی بواری پرۆگرامسازی راپانگەیاندووە.. کاتێک رۆژانە نزیکەی نیوکاتژمێر بۆ رامان "تأمل" تەرخان دەکەیت.. ئەوا یارمەتی مێشکت دەدات بۆ قاڵبوونەوە "الترکیز"و بیرکردنەوەی ژیرانە.. ئەمەش بە باشی لەو کاروبارو بڕیارانەی کە لە ماوەی ئەو رۆژەدا دەتەوێت ئەنجامیان بدەیت، رەنگ دەداتەوە.

هەر دوو لێکۆڵەر (ئەمیشی جیها، مایکڵ بایم) لە زانکۆی پەنسلڤانیا.. ئاماژەیان کردووە بەوەی کە رامان یارمەتی مێشک دەدات بۆ قاڵبوونەوەو ڕیزبەندکردنی کارەکان بە پێی لە پێشینەیی و بە شێوەیەکی باشتر..

بـۆ ئەنجامدانـی کاروبـارەکان بـە وردیو بەدیهێنانـی ئامانجـەکانو ژیرانـە شـیکردنەوەی زانیارییەکانو وریابوونـەوەی هزروهـۆش لـە هەلومەرجی جیاوازدا.

لێکۆڵینەوەکـە ڕوونی کردووەتەوە کـە تەرخانکردنـی کاتێکـی کـورت بۆ ڕامان لـە ماوەی ڕۆژێکـدا.. تەنها وەرگرتنی چارەسـەر نابەخشـێت بە مرۆڤ.. بەڵکو دەبێتە هۆی زیادبوونی ئاسـتی بەرهەمی لە کارداو زیادبوونی توانای لە وەرگرتنی زانیاری گشتیدا.

پوختـەی لێکۆڵینەوەکـە ئەمەیە: ڕۆژانـە تەرخانکردنی نیـو کاتژمێر بـۆ ڕامـان.. ئاسـتی ئاگاداربـوونو قاڵبوونـەوە.. لـە لای ئەو کەسـانەی بەرپرسیارێتی گەورەیان لەسەر شانە، باشتر دەکات.

**بـۆنو بەرامـە خۆشـەکان کلیلی بیرکردنەوەن:**

زانـا ئەمریکییـەکان گەیشـتوون بـە ئـەو ئەنجامـەی کـە هەندێـك بۆنی خـۆش هەیە.. وا لـە لە مرۆڤ دەکات، زیاتـر توانـای بیرکردنەوەی دروستو هاوسەنگی هەبێت.. یارمەتی کەمبوونـەوەی هەڵەکانیـش دەدات.. کە ڕەنگـە ئەنجامیان بدات. ئەو بۆنە سروشتیو خۆشانە کارتێکردنی سەیری لە سەر کۆئەندامی دەمارو بیرکردنەوە هەیە. بۆ نموونە بـۆدرەی منداڵ کار لە دەماخی منداڵ دەکاتو هانی دەدات هەست بە خۆشی بکات.

لـە پـاش ئـەوە وا دەردەکەوێت.. بۆنـە خۆشـەکان بـۆ بیرکردنەوەی هاوسـەنگ، هێـزو وزە بـە مێشـك نابەخشـن.. هـەروەك پاتـری ڕادیۆو ئامێری کارەبایی سەرتاشـین بارگاوی "شحن" دەکرێتەوە.

لێکۆڵەرەکان جەخت لەوە دەکەنەوە کە مرۆڤ لە توانایدا هەیە.. بە یارمەتی بۆنە خۆشـەکان، شـەپۆلەکانی دەماغ بگۆڕێـت.. هـەروەك ئـەوەی دکتۆری ئەمریکـی "داڵـن هیرش" سـەرۆکی دەزگای لێکۆڵینەوەو چارەسەرکردن بە بۆن لە شـیکاگۆ پێداگری لەسەر ئەو ڕاستییە دەکات.

سەرچاوە: ئینتەرنێت

# ببە بە فاریزە، نەك بە خاڵ

دڵشاد محەممەد

هەمیشە هەوڵبدە لە ژیاندا فاریزە (،) بیـت، نەك خـاڵ (.)، لەبەر چەند هۆیەك، لەوانە:

* ببـە بە فاریزە کاتێك کۆسـپو تەگەرەیـەك لـە ژیانـدا دێتـە ڕێت، بۆئـەوەی ژیانت هەمیشـە بـەردەوام بێـت.. مەبـە بە خـاڵ کە لـە کاتی ڕوودانی هەر کێشـەیەکدا ڕاوەسـتیو بەردەوام نەبیت.

* ببە بە فاریزە تا پێبکەنیو بزە لەسـەر لێوانت بێـت، کاتێك خەریکە فرمێسـکەکانت دەوەرنو بـە گۆناتدا دێنەخـوار.. مەبـە بـە خـاڵ کاتێك فرمێسـکەکانت تـەواو دەبـن، ئیدی تەسـلیم بـوونو بـە چۆکـدا هاتنت ڕابگەیەنن.

* فاریـزە بە کاتێـك ڕووبەڕووی خراپـەو ناپاکی هـاوەڵو دۆسـتانت دەبیتـەوە.. مەبە بە خاڵو کۆتایی بە دروسـتکردنی پەیوەندی دۆسـتایەتی بهێنیت، چونکە ژیان بەردەوامە.

* ببە بە فاریزە کاتێك هەڵوێستێك دەبینیت کە دڵـت غەمبارو نارەحەت دەکات.. مەبـە بـە خاڵ تا لە ئاسـت ئەو دیمەنو هەڵوێستەدا ڕابوەستیتو دەستەوسـان بیت، چونکـە دەتوانیت بیگۆڕیت..

* ببـە بـە فاریـزە کاتێـك لەسەرەڕێی ئومێدو هیوادا دەکەویتو پێـت هەڵدەخلیسـکێت.. مەبـە بـە خـاڵ لە یەکـەم کەوتنتدا بوەسـتیت و نائومێـدیو بێهیوایی لە دەروونتدا چەکەرە بکات..

* فاریـزە بـەو لـە ژیانتـدا بە گەشبینییەوە بژیو لە بەرانبەر خەمو خەفەتـدا لاواز مەبە.. مەبە بە خاڵو لە یەکەم خەمو پەژارەتدا ژیان لە لای تۆ بوەستێت و کۆتایی پێبێت..

* فاریزە بەو لە ژیانت بەردەوامبەو لە هەڵەو شکستەکانت پەند وەربگرەو وانـەی نوێ فێربـە.. مەبـە بە خاڵ کە لەگـەڵ ڕوودانی یەکـەم هەڵەتدا بووەسـتیت، چونکە لـە هەڵەکانتەوە فێر دەبیت.

* لەم ژیانە کاتیو بڕاوەدا ببە بە فاریـزەو بە کردەوە باشو جوانەکانت ژیانـت بڕازێنـەوەو بەرهەمـدارو پڕ پیتو بەرەکەتی بکە.. وریابە لەم ژینەدا نەبیتە خاڵو لە ئاسـت ئیغرائاتەکانی شەیتاندا چۆك دابدەیت..



# پێشەواکەم

شاگوڵ عوسمان

پێشەواکەم خۆشم دەوێیت، ئەزموونی خۆشەویستی تۆ بۆ من لە نیگار کێشێك دەچێت، کە توانای هەڵبژاردنی ڕەنگەکانی نەماوە... پەنجەکان تۆراو دەبن لە نووسینی وشەیەك.. لێوەکان نایەنە گۆ بۆ وتنی سرودێك کە ئاهێك بێت بۆ دڵی من، ئاسمانێك لە شەوانی بیاباندا توانای ڕواندنی ڕوناکییان نییە، ئەوەی کە هەست بەم ڕووخسارە ناکات، چاوانم خێرا خێرا فریای وێنەگرتنی ئەم وێنانەی نییە، وا دەیان بینم دەڵێ لەگەڵتدا بووم، چەند خۆشحاڵ دەبووم گەر وابوایە بۆ من...

پێشەواکەم سەروەری نێو گشت خەونەکانم.. لە ئەزموونێکی بچووکی ژیانی مندا.. هێدی هێدی دەروازەکان دەکەمەوەو لە چاو خێرایی ئەم سەردەمەی مندا.. نزیکەی وامەرگە.. ڕووخسارەکان هەموو جیاوازن.. دەستەکان هاتوونەتە کورتی.. لێوەکان خەندە تۆراوە لێی... دڵێك هەیە پێشەواکەم پڕ لە کەموکورتی.. گەنجێك هەیە بێ توانا.. پیرێکی شەوانە بێ سەرنج هەیە.. برسی پڕ لە ژیان هەیە.. خەمو سەرگوزشتەکان گریان دێنێت.. بێ سەبوری لە ڕێگاکان.. پێویستم پێتە پێشەواکەم... شەوەکان ڕێگەکەیان هێندە دوورە بە چەند ڕۆژێکیش بێت تاریکی ناشکێنن... سەختییەکان هێندە زۆرن.. تۆی جێگەی متمانەی منیت، تۆی ڕێگە دوورودرێژەکانم بۆ کورت دەکەیتەوە... تۆی خاوەنی پڕ لە دانایی‌و پێشەوایەتی بۆ من، گەر لە بەرزاییەکانی چیاوە بەردم تێ بگرن بۆ بوونی ژیانێکی تر، ڕێگە دەبڕم بە دەم نزاوە داوادەکەم لە تۆوە فێربووم کە ئاواتەخوازی چاکە بم بۆ ئەوان... بێ ترس لە ئێش‌و ئازار...

پێشەواکەم... ئەی سەروەری چاخەکان... لە نێو هەموو ئەم حەسرەتە.. کە ژیان چەندە قورس بێت.. بێ ئەوەی بینۆشم تاڵییەکەی هەستی پێ دەکەم... ئەم غوربەتەم بە خەیاڵێك لە تۆ ئاسودەم دەکات.. بە ڕووخسارێك لە نێو ئەم ژیانە.. کە هەرچەندە دۆستی خەم بم... بە ئومێدی جاران. دەڕۆم تادەگەمە خاکی بیابان.. دەڕۆم تادەگەمە ئەشکەوتی یاران.. دەڕۆم تادەگەمە ئەو شارەی پڕە لە خۆشەویستی سەروەرمان، لە گەڵ تۆ دەڕوانم.. لەسەر بەرزاییەکەی تا چاوم بە شوێن پێیەکانی تۆ نەزر کەم... ئەی پێشەواکەم گەر لە یەکەم هەنگاوی خۆت نامان سپێری.. کۆتاییمان هەروا بە تەنیا مەهێڵەوە.. پێویستمان پێتە..

پێشەوا پڕ لە سەروەرییەکەم... ماڵە پڕ لە ئاوەدانەکەم... خوانە پڕ شیرینەکەم... شەوە پڕ لە خەونەکەم... سەبوریت پێیە.. لە مردنی چۆلەکەی دەستی منداڵێك کە ڕۆژانە یاری پێدەکەم.. پەیتا پەیتا دڵنەواییت دەدانێ.. چەند زۆرن ئەو منداڵانەی لە نێو ئازارەکانی دنیا ئەوانیش یاریان بیر چۆتەوە، وەکو گەورەکان فێری کێشمەکێشی ژیان بوون.. ئەی من لە کوێدام؟ هەروەك ئەو منداڵە.. زیاتر پێویستم پێتە، لاوێك بوو... بە ئاشکرا زۆر بە ئازارەوە.. زۆر بە ڕاشکاوی لە نێو ئارەزووەکانی دنیا تەنگیان پێ هەڵچنی بوو.. هەروەکو ئێستا چەندە پرسیاری لە ماڵدا لادروست دەبێت... لە بێ ماڵیدا کۆڵان دەبێتە پرسیاری.. ژیانی ماڵی خوایان لێ زەوت کرد.. ناچارن ببینە ڕێبواری (نادی‌و کافتریاو گازینۆکان... عەقڵمان بکەینە گیرفانی پارەدارەکان... چونکە ئێمە دوای ماڵ‌و خێزانمان شوێنێکی تر دەبێت هەبێت لێی کۆببینەوە.. ئەویش قوتابخانەکەی

پێشـــەواکەمە... مزگەوتەکان).. پێشەواکەم بەوپەڕی ئەزموونی دەســـتی پڕ لە سۆزی لەسەر ســـنگی کردە شفایەك.. ئای دەبێت دڵەکان لە جێی خۆیاندا بن؟ یان شـــتێك لـــەم زەمەنـــەدا نەمـــاوە بـــۆ دڵـــی ئێمە! دەبێت چەند زەمەنێك بێت لەســـەرا بین تـــا دڵەکانمان بچێتەوە شـــوێنی خۆی؟ لە نێو ژیانی ئازاری ئێستای کیژۆڵەکانماندا، هەمووی لە ڕۆحێکی هەژار گوزەر دەکەنو پێـــش ئـــەوەی نێوچاوتـــان گـــرژ بکەن.. بۆ ئـــەو هەموو قوماشـــەمان لـــە خۆمان ئاڵانـــدووە... کەچی هێشـــتا بـــێ بەرگین؟ جارێـــك لە خۆت ببـــورە باوکەگیان وەرن لەگەڵمان بۆ بازاڕ باجلەکان حەزی تۆشـــی تێدابێـــت... هەروەکـــو لە حەســـرەتەکانی پێشـــەواکەمدایە، (کچەکـــەم... گەردنـــت داپۆشـــەو.. ترســـت بـــۆ ژێرکەوتنـــیو زەلیلبوونی باوکت لە دڵدا نەبێت...) زەلیلو دۆڕاندن لە بێ بەرگیدایە نەك لە پۆشـــتە ڕێکیـــدا... ببـــورە پێشـــەواکەم.. ئەم ڕازەم بـــۆ تۆ دەڵێم.. گـــەورەکان لە گەورەبوونی ئێستای خۆیان لە ئێمە دەڕوانن، هەتا ئەو کاتـــە ئێمەیان دەوێت کـــە هەڵە نەکەین.. بـــە تەنهـــا پێشـــەواکەم تـــۆ دەزانـــی ئەو ئازارانـــەی دەیچێژم چـــۆن دەمخاتە یادی خۆشەویستی تۆوە.. ئەوسا هەرچی خەمە لـــە بیردەچێتـــەوە.. ئـــەوەی دەمێنێتەوە بـــە درێژایی ئازارەکە دەبێتە ســـەراپایەك لە خۆشەویســـتی بۆ تۆ خۆشەویستەکەم.. تاقانـــەی نێـــو ســـەروەرییەکەم.. گەر تۆ نەبیـــت.. منیش چیـــم زیاتـــرە لەوانەی هەردێوانـــەی دنیا دەبـــوو، ئەمە منەتی خۆشەویستی تۆیە لەسەر دڵی مندا جێماوە من مەمنونم پێشـــەواکەم... پێشـــەواکەم.. بێکار منت بەجێنەهێشـــت.. حەزی ژیانت پێدام... هەموومان هاوشێوەی (بلال) وەکو ئـــەو گەنجـــە ناخمان ســـوتاوە... لەســـەر پشـــکۆ ژیان دەگوزەرێنیـــن... تەنها تەنها دەبێـــت کێ بێت ڕاســـتگۆیانە.. بە پولێکی بـــێ خەوش.. ئەم دڵە پڕ لە حەســـرەتە.. پڕ لە دەنگە زوڵاڵـــە بمانکڕنەوە.. چونکە ئێمـــە خزاوینەتە نـــاو بەندکراوی ئەوانی ترەوە... ئەی پێشـــەواکەم.. ئەوەی لە تۆوە فێربـــووم هیچ کـــەس نەیتوانـــی بمکاتە قوتابـــی خـــۆی... پێشـــەواکەم.. تۆ فێرت کردم لـــە دەوری ئەوانـــی تربژیم.. فێرت کـــردم بـــە زەردەخەنە بڕوانم بـــە ژیان..

جـــا زەردەخەنەکان چاکەیەك بن.. دەبێت جوڵەیەکـــی ئەو زمانە.. چـــۆن پڕکەم لە گرەنتـــی بۆخۆمو ئەوانی تر... لە کام لاوە لێـــت بڕوانم پڕیت لە ســـەروەری بۆ من.. ســـۆزو بەخشـــندەییت.. دڵنەوایـــی.. هیچ سۆزێك نییە بگات پێت... ئای پێشەواکەم.. لە بێ ســـۆزی ئەم ڕۆژەگارە.. دڵم تەنگە... گریانەکانی ئێستام شاهیدی ئەوە دەدەن... بـــۆ شـــەوێکی ئاســـوودە دەگەڕێـــم تێـــر تێربنـــووم.. بۆ ڕۆژێکی تێـــر دەگەڕێم تا بمگەیەنێتـــە شـــێوان.. بـــۆ هەنگاوێك مل دەنێـــم تا کۆتایی بێرییەکانم.. نازانم ئەم کۆتاییە چەند ســـەرەتای تـــری ماوە... بۆ دڵێـــك دەگەڕێم کە ئاشـــنای نێـــو هەموو بینینەکانی سرەوتی ژیانم بێت، بۆ ماڵێك دەگەڕێـــم پـــڕ بێت لە قوربانـــی بێ هیچ مەرجێك... بۆ پولێك کاربکەم.. خۆشحاڵم بکات.. نەبمە ئازار بۆ هیچ کەسێك لە تاو گیرفانە بەتاڵەکەم... بۆ چاوێك دەگەڕێم.. بـــۆ بینن... کە تەنها بـــە ڕووەکاندا بڕیار نەدات... بۆ دەســـتێك عەودالم.. کە ترسم پێ نەکاتە خەرابێك... لە خۆشەویســـتیت دەگەڕێم ڕاســـتەقینە بێت... بە دوور بێت لە ڕاکـــردنو ترسو خوازیاری ژیانم بکات نـــەك بمترســـێنێو خوازیاری بـــە مەرگ بێـــت.. دڵێکـــم دەوێـــت عاشـــقی هەموو وردودرشـــتی هەنگاوەکان بێت.. کردارێکم دەوێت تا قەزای شـــوێن پێیەکانی تۆ.. بە خۆشەویســـتەوە قبوڵ بکرێـــت.. ئازایانە.. گەنجانـــە... چەنـــدم خـــۆش دەوێـــت.. هاوڕێیەکم دەوێت... پڕ بێت لە ڕاستگۆیی.. لێـــوان لێو لە دادپەروەری... ســـەرتاپایەك بێت لـــە حورمەت... نیشـــانێکبێت پڕ لە بوێری... ئەی پێشەواکەم.. خۆشم دەوێیت.. قوربانت بم بە خۆمو گشت خۆشەویستانمو گشت ئەو خەونانەی کە تەمەنناى دەکەم لەوە زیاتریشم نییە.. پێشەواکەم.. خاوەنە سۆزو خۆشەویســـتییەکەم.. بانگم بکە بۆ لای خۆت.. چی تر حەز بە تەنیایی ناکەم.. دەســـتم بگـــرە هەرچـــی هەیە پێویســـتم پێتـــە دڵنەواییم بەیتـــەوە.. من لە ڕیزی ئـــەو چاکانەی تۆ دانیم کـــە تۆ دەتەوێت بەخشـــندەییو لێبوردەیی خۆت بە فریای هەمووان بێتەوە.. ســـڵاوت لێبێت پێشەوا بەڕێزو ســـەروەرو بەســـۆزەکەم. خۆشـــم دەوێیت. خۆشم دەوێیت. خۆشم دەوێیت... پێشەواکەم.

بەهمەن لەتیف

# تۆ و مرۆڤەکان

١- مرۆڤەکان زۆربـــەی کات ناڵۆژێکنو بێ متمانەو خودپەسەندن.
هەر چۆنێك بێت لێیان ببورە.

٢- ئەگەر کەسێکی بەخشـــندە بیت، مرۆڤەکان بە خۆپەرســـتو هەلپەرست لە قەڵەمت دەدەن، بەڵام تۆ گوێ بە قســـەی ئەوان مەدەو هەمیشە بەخشندە بە.

٣- ئەگەر مرۆڤێکی سەرکەوتوو بیت، دەبیتە خاوەنی چەندین هاوڕێی نادڵسۆزو دوژمنی ڕاستەقینە.
هەرچۆنێك بێت تۆ سەرکەوتوو بە.

٤- ئەگـــەر ڕاســـتگۆو دڵســـۆز بیـــت، هەڵتدەخەڵەتێننو فێڵت لێ دەکەن.
بەڵام هەمیشە دڵسۆزو ڕاستگۆبە.

٥- ئاگاداربـــە ئەوەی تـــۆ بە چەندین ســـاڵ بنیاتی دەنێیت، مرۆڤەکان بە شەوو ڕۆژێك وێرانی دەکەن.
هەرچۆنێك بێت بنیاتنەر بە.

٦- کاتێـــك ئارامـــیو خۆشـــبەختی دەدۆزیتەوە، هەندێك ئیرەییت پێ دەبەن.
بەڵام هەمیشە دڵخۆش بە.

٧- چاکەکانی ئەمڕۆت، سبەینێ لە یاد دەکرێت. هەرچی بێت هەمیشە چاکەخوازو چاکە کار بە.

٨- تـــەواوی تواناکانـــت بەکاربهێنـــە، هەرگیز لێشـــت ڕازی نابن. بەڵام هەمیشە باشتربوون پێشکەش بکە.

٩- لـــە کۆتاییـــدا بزانـــە، تـــەواوی کردەوەکانـــت لـــە نێوان خـــۆتو خوادان. هەرگیز لە نێوان تۆو مرۆڤەکاندا نین.



# وانەیەك بۆ ڕەشبینەكان

هارون ڕەشید/ كەركوك

لە یەكێك لە بەندیخانەكانی كۆشكدا كۆمەڵێك كەس بەند كرابوون، یەكێك لە زیندانییەكان بڕیاری لە سێدارەدانی بەسەردا درابوو، بەو پێیە تەنها دوومانگی لە ژیاندا مابوو، واتە دوای دوو مانگی دیكە ئیدی كۆتایی بە ژیانی دەهێنرێت، بەڵام ئەم زیندانییە لە بری ئەوەی خەمو بێزاری بە ڕووخسارییەوە دیار بێت، زەردەخەنەو پێكەنینی لە سەر ڕووخساری نەخشاندبوو، تەواوی بەندكراوەكان بە هەڵوێستی ئەو زیندانییە زۆر سەرسام بوون، لە كاتێكدا ئەو بە پێی بڕیاری پادشا دوای دوو مانگی دیكە لە سێدارە دەدرا، بەڵام زۆر ئاسایی دەهاتە بەرچاو!

هەر بۆیە ڕۆژێك یەكێك لە بەندكراوەكان لێی نزیك بوویەوەو پێی گوت: ئێمە هەموومان لێرەدا زیندانین، لە زیندانیشدا كات زۆر بە درەنگ تێ دەپەڕێت، بەسەر بردنی ڕۆژەكانی نێو زیندان یەكجار سەختە!

بەڵام هەر یەك لە ئێمە بە ئومێدی ڕۆژی دیاریكراوی ئازاد بوونمانەوە كات تێدەپەڕێنین، لە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەدا كات بەسەر دەبەین، دڵخۆشی خۆمان بەوە دەدەینەوە كە سات لە دوای سات لە ئازاد بوونمان نزیك دەبینەوە، من یەكێكم لەو كەسانەی كە بڕیارە دوای سێ مانگی دیكە ئازاد بكرێم، هەموو ساتێكم لە نێو ئەم بەندیخانەیەدا لە چاوەڕوانی ڕۆژی ئازادبوونمدا بەسەر دەبەم، بەڵام تۆ دوای دوو مانگی تر لە سێدارە دەدرێیت، ئەی تۆ بە چ ئومێدێكەوە ڕۆژەكانت لێرەدا بە سەر دەبەیت؟ من دڵخۆشم بەوەی كە دوای سێ مانگی تر ئازاد دەكرێم، بەڵام تۆ نیگەران نیت بەوەی كە دوای دوو مانگی تر لە سێدارە دەدرێیت؟

دەبوایە تۆ ئێستا دڵتەنگو خەمبار بوویتایە، چونكە تۆ سات بە سات لە ڕۆژی مردنت نزیك دەبیتەوە؟ لەگەڵ ئەوەشدا هیچ دوو دڵیو ترست پێوە دیار نییە؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی: من وابیردەكەمەوە كە دوای دوو مانگی تر ئازاد دەكرێمو زۆر بە ئاسایی چاوەڕوانی ڕۆژی ئازاد بوونم دەكەم.

زیندانییەكە زۆر بەسەر سامییەوە لێی پرسی بۆچی وابیر دەكەیتەوە؟!

وەڵامی دایەوەو پێی وت: چونكە ئەگەر وانەكەم ئەوا ئەم ساتانەی كە ماومە بە فیڕۆ دەڕوات، بەم كاردەم ناهێڵم ترسو دوودڵی ژینی ئێستام تێكبداتو ژیانم بشێوێنێت، چونكە خەمباریو ترس هیچ لە بابەتەكە ناگۆڕێتو هیچ سوودێكم پێ ناگەیەنێتو دادم نادات، بۆیە هەمیشە وادادەنێم كە دوای دوو مانگی تر ئازاد دەكرێم!

زیندانییەكە كە ڕۆژەكانی تەمەنی زۆر ئاساییو بە سادەیی بەسەر دەبردو نەیدەهێشت ترسی مەرگ بە ڕووخسارییەوە دیار بێت، تا دەهات زیندانییەكانی تر خۆشیان دەویستو هۆگری دەبوون.

تا ئەو ڕۆژەی ڕۆژی لە سێدارەدانی هات، كاتێك ملیان كردە پەتی سێدارەوە هەموو زیندانییەكان بۆی دەگریان بە جۆرێك كە پادشا بەم كارە زۆر سەرسام بوو، خۆی بۆ نەگیراو پرسیاری لە یەكێك لە زیندانییەكان كرد، ئەویش بابەتەكەی تێگەیاند، پادشاش بە وردەبەرزی ئەو لاوە زۆر سەرسام بوو! هەر بۆیە فەرمانی دا كە ئازادی بكەن، تا ببێتە وانەیەك بۆ ئەو كەسانەی كە لە ژیانیاندا ڕەشبینن.

ڕەشبینن لە بەرامبەر كارەكانی ڕۆژانەیانداو بێ ئومێدن لە ئەنجامی كارەكانیانداو هەمیشە لە كارەكانیاندا لایەنە خراپەكە لەبەرچاودەگرنو لایەنە باشەكەی فەرامۆش دەكەن، تا تێ بگەن ترس لە كارو خەمخواردنی بێ سوود تەنها ژیانیان تاڵ دەكات، تا بزانن كە گەشبینی چرایەكە هەمیشە ڕۆشنو داگیرساوە نە بە باو نە بەباران ناكوژێتەوە.



# با خەیاڵو بیرکردنەوەکانت ئازاد بن

دیمەن حەیدەر

خەیاڵ، یاخود بیرکردنەوە ئەو توانایەیە کەلە هەموو مرۆڤێکدا خوڵقێنراوەو بریتییە لە بیرکردنەوە لە ڕووداوەکانی ڕابردوو، یان ئەو ڕووداوانەی کە هێشتا ڕوویان نەداوەو لە داهاتوودا ئەگەری ڕوودان، یان پێشبینی ڕوودانیان لە لایەن کەسەکەوە لێ دەکرێت، یان لە کاتی دروستبوونی پرسیارێك لە مێشکی مرۆڤەکانداو وەڵامەکەی بە ئاسانی دەست نەکەوێت، پەنا بۆ خەیاڵو بیرکردنەوە دەبات تا لەو ڕێگەیەوە بە دوای وەڵامەکاندا بگەڕێت. هەموو مرۆڤەکان هەر لە قۆناغی منداڵییەوە کە زۆرترین بیرکردنەوەو خەیاڵی بێ سنوور لەم قۆناغەی ژیاندایە بەو پێیەی قۆناغی سەرەتایی ئاشنا بوونی مرۆڤەکانە لەم جیهانی بوونەداو زۆرترین بڕی بیرکردنەوەی پێویستە، بەڵام بە گەورە بوونی مرۆڤ وردە وردە ئەم توانایە هەر وەك هەموو شتەکانی تر تیایدا کز دەبێتو کێشەو گرفتەکانی ژیان سەرقاڵی دەکات، بۆیە پێویستە لەگەڵ گەورە بوونیشماندا ئەو توانایەی منداڵی لە خۆماندا زیندوو بکەینەوە. بە گشتی خەیاڵو بیرکردنەوە بەشێکی زۆری لە ژیانی هەندێك کەسدا داگیرکردووە، بەڵام لای هەندێك کەسی تر ڕەنگە هەر گرنگیشی پێ نەدەنو سنورێکیان بۆ بیرکردنەوەکانیان لە ژیاندا کێشا بێت. بە زۆری مرۆڤ کاتێك ڕووبەڕووی زۆرترین خەیاڵو بیرکردنەوە دەبێت کە ئەو ڕووداوانەی ڕوودەدات لە ژیانیدا بە ویستی ئەو نەبنو لە جۆری ژیانی خۆی ناڕازی بێت، یاخود ئەو ئامانجەی کە دەیەوێت لە واقیعدا بەرجەستە نابێتو پەنا بۆ خەیاڵکردن دەبات تا هیچ نەبیت لە ڕێگەی خەیاڵەوە ئامانجەکانی بەدی بهێنێت.

ڕەنگە زۆربەمان هیچ بۆمان گرنگ نەبێت، ئایا خەیاڵ لە ژیانماندا تا چەند ڕەنگی داوەتەوە، لە ڕاستیدا بیرکردنەوەو خەیاڵ لە ڕوانگەی دەروونناسییەوە گرنگییەکی زۆریان لە ژیانی هەریەکەماندا هەیە، بە ڕێژەیەك کە ڕێڕەوی ژیانمان دەگرێتە دەست، ئێمە هەرچۆنێك خەیاڵو بیرکردنەوەکانمان دابڕێژین بەرەو لای ئەوە کێش دەکرێین، بۆ نموونە ئەگەر هەمیشە لە خەیاڵتدا بوویت بە نووسەرێکی بە ناوبانگ ئەوا ئاڕاستەی ژیانت بەرەو بوون بە نووسەرێکی بە ناوبانگ کێش دەکرێتو هەموو هەوڵێکت لەو پێناوەدا بەبێ ماندوو بوون چڕ دەکەیتەوە، هەتا بە مەبەست دەگەیت. یاریزانێکی بە ناوبانگی وەك (محەممەد عەلی کلای) ئەو هەر لە منداڵییەوە خەونی بوون بە یاریزانێکی بە ناوبانگی بۆکسێنەوە دەبینی، بەو شێوەیەش بۆ هەموو کەسە بەناوبانگەکانی جیهان زانایەکی گەورەی وەك ئەنیشتاین دەڵێت: (خەیاڵ لە زانست گرنگترە)، بەڵام دەبینین هەندێك کەس هەرگیز جۆرە خەیاڵو بیرکردنەوەیەکیان سەبارەت بە ئاواتو ئامانجەکانیان لە ژیاندا نییە، لەگەڵ ئەوەشدا پێشیان سەیرە بۆچی ژیان بە دڵی ئەوان ناچێتە پێش!

لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامیشدا خەیاڵو بیرکردنەوە شوێنێکی گرنگیان پێ دراوە بەو پێیەی خوای گەورە لە قورئاندا هەمیشە جەخت لە بیرکردنەوە لە دروستکراوەکانی دەکاتەوە لە لایەن ئێمەی مرۆڤەوەو بە یەکێك لە پەرستشە گرنگەکانی موسوڵمانی دادەنێت، بۆچی؟ هەر لەبەرئەوەیە کە ئەو جۆرە خەیاڵکردنە مرۆڤ کەمەندکێش دەکات بەرەو زیاد بوونی باوەڕەکەیو نزیکبوونەوە لە خوای خۆی. ئەگەر دەتەوێت ڕۆژێك لە ڕۆژان ببیتە وەرزشەوانێکی بەناوبانگ، ئەوا هەمیشە خەیاڵو بیرکردنەوەکانت لەسەر بوونت بە وەرزشەوانێکی بەناوبانگ لە داهاتوودا چڕ بکەرەوەو هەمیشە سەیری کەسە سەرکەوتووەکان لەو بوارەدا بکە، دڵنیام کە دەتوانیت پێی بگەیت، یان ئەگەر دەتەوێت پەیوەندییەکی دژوار بۆ یەکەم جار وەرگریت، قسە کردنت لەگەڵ بەرپرسێك، یان بەڕێوەبەرەکەت، یان هەر کەسێکی تر ئەوا لە زەینتدا چەندین جار ئەم پەیوەندییە بە سەرکەوتوویی وەرگرە، تا سەرەنجام دەتوانیت لە واقیعدا بە سەرکەوتوویی جێبەجێی بکەیت بێ هیچ کێشەیەك.

بەمجۆرە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە دەتەوێت، یاخود ترست لە ئەنجامدانیان بە سەرکەوتوویی هەیە، هێزی خەیاڵو بیرکردنەوەت بخەرە کارو سەرکەوتووبە، مەترسە لە خەیاڵو بیرکردنەوەی گەورە، بهێڵە با خەیاڵت بگاتە هەورەکان، هیچ سنورێك بۆ خەیاڵو بیرکردنەوە بە پێزەکانت دامەنێ، بەو بەهانەیەی کەوا ئەو شتەی بیری لێ دەکەیتەوە بۆ تۆ گەورەیەو ناتوانیت پێی بگەیت، هەموو مرۆڤە سەرکەوتووەکانی وەك: (ئەدیسۆن، ماجەلان، فاسکۆ دی گاما، گالیلۆ... هتد)، مرۆڤێك بوون وەك ئێمە، بەڵام ئەوەی ئەوانی گەیاندە ئەو پلەوپایە بیرکردنەوەو خەیاڵی بێ سنوور بوو.

کەواتە گەر دەتەوێت شێوازی ژیانت بگۆڕیتو بە ئامانجەکانت بگەیت، ئەوا ڕێگە بدە با خەیاڵو بیرکردنەوەکانت ئازاد بن!



# وەرزەکانی ژیان

زاهیر زانا

هەمیشە ژیان لە گۆڕانو بزاوتنو هاتووچۆدایەو بەردەوام دەجولێت، هەروەك چۆن سروشتی زەوی کە بە سروشتی خۆی شەوو ڕۆژو وەرزەکانی هەیە، بە هەمان شێوەش ژیان شەوو ڕۆژو وەرزەکانی هەیە، لە شەوو ڕۆژی زەویدا تاریکیو ڕووناکی دەبینینو لە شەوو ڕۆژی ژیانو زیندەگیشدا سەرکەوتنو شکستو بردنەوەو دۆڕاندنو ڕەشبینیو هیواو وازهێنانو کۆڵنەدانو ...هتد، دەبینین، لە وەرزەکانی زەویدا زستانو پایزو بەهارو هاوین کە فێرمان دەکەنو ناچارمان دەکەن لە وەرزە بەرهەمدارەکاندا زەخیرە بۆ وەرزی بەستەڵەکو قاتو قڕی ساز بکەین، ئەگەرچی زستان سەختو دژوارە، بەڵام پڕ بایەخو بەسوودە، ئەگەر شەختەو کرێوەو باوبۆران نەبێت، بێگومان بەهار ڕازاوەو جوان نانوێنێت، بەڵکو پەککەوتەو بێ کەڵك دەبێت، ئەوە زستانی ساردە مژدەی هاتنی بەهاری سەوزی پێیەو هەگبەکەی پڕە لەخێرو خۆشی، بەڵام لە وەرزەکانی تردا پێمان دەبەخشێت، ئەمەش تەنها ئارامگرتنی پێویستە.

هەموو وەرزەکان پێویستو پڕ سوودنو دووبارەدەبنەوەو مرۆی ژیریش وەك پێویست سوود لە هەر یەکێکیان وەردەگرێتو لە وەرزێکدا دەکێڵێتو دەچێنێتو لە وەرزێکی تردا بژار دەکاتو خاوێنی دەکاتەوەو لە وەرزێکی تردا کۆی دەکاتەوەو دەیدروێتەوەو پاشەکەوتی دەکات!!

بێگومان وەرزەکانی ژیانیش بە هەمان شێوەیە، ڕۆژگارێك لای مرۆڤ سەختو دژوارەو نارەحەتییەکانی ژیانو بەربەستەکانی ڕێگاو ڕەشەباو ڕەهێڵە جۆراو جۆرەکان لای هەندێك مرۆڤ دەبن بە پاساوو هەر زوو کۆڵ دەدەنو پاڵ دەدەنەوە، بێ ئاگا لەوەی ئەمڕۆ وەرزی چاندنەو ئەو بارانەش هەرچەندە بەلێزمەو گوڕو تین بێت پێویستە بۆ سەوزبوونی بەرهەمی ژیان، سەرەنجام وەرزێك دێت زەوی تەمەنمان سەوز دەبێتو لە بەرهەمەکەی دەخۆینو بۆ ڕۆژگارە سەختەکان پاشەکەوتی دەکەینو دەیکەینە زەخیرەیەکی بەسوود بۆ کاتی نەهاتی.

کەم نین ئەوانەی بێزارو ناڕازین لەوەی بارانو بەفر لە وەرزێکی تەمەنیاندا دەبارێت، چونکە بێ ئاگان لەو ڕاستییەی هەتا زستان سەختتر بێت بەهاری ڕەنگینترە! هەروەك چۆن بێ ئاگان لەوەی لە وەرزەکانی تەمەنیان کەڵك ببینن، هەمیشە خەریکی سکاڵان لە حاڵیان لە بری ئەوەی بچێننو خەریکی تێکۆشانبن، هەربۆیە هەمیشە زەوی تەمەنو ژیانیان وشكو سوتماکەو گوڵەگەنمێکی تیا سەوز نابێت! لەوەش سەیرتر ئەوەیە هەمیشە سەرقاڵو دڵتەنگن بەوەی بۆچی زەویو باخی ژیانی فڵانەکەس ڕازاوەیەو هی ئەمان بیابانو وشکە، بیریان چۆتەوە مرۆڤ هیچ نەچێنێت هیچ نادروێتەوە، هەر دەستکەوتێك پێویستی بە تێکۆشانو ماندووبوونە، (ئەگەرچی خوای گەورە ڕزقی هەموو باڵندەیەکی داوە، بەڵام بۆی ناکاتە هێلانەکەیەوە). ئەم ڕستەیە بۆ مرۆڤیش تەواو بەجێیەو هەرکەسێك سوود لە وەرزەکانی ژیانی وەرنەگرێتو زەوی تەمەنی نەچێنێت هیچی لێ سەوز نابێت.

تۆش چیتر چاوەڕوان مەبە، دژوارییەکانی ژیانت، زستانی تەمەنتە، ئەو بەفرو بارانەی بەسەرتا دەبارێت بێزارت نەکاو بە چاوی هیواوە لێی بڕوانە، چونکە دەبێتە هۆی سەوزبوونی باخی ژیانتو کانیو کارێزی تواناو لێهاتوییەکانت دەژێنێتەوە، چاوەڕوانیی بێ ئاکامەو لە هەر وەرزێکی تەمەنتدا بە جۆرێك تێکۆشان بکە تا لە ڕێگەیەوە زەخیرەی باشو بە کەڵكو زۆر پاشەکەوت بکەیت، بڕیار بەدەستی خۆتە، دەتوانی هەمیشە خەریکی سکاڵابیت لە شەوو ڕۆژی ژیانت، بەڵام سکاڵا هیچ بەرهەمێکی نییە، هەروەك چۆن دەکرێت لە شەوی ژیاندا پشوو بدەیت بۆ ئەوەی کاتێك ڕۆژ بووەوە زیتەڵو چالاكو گورجوگۆڵ بیت، بە هەمان شێوە لە وەرزەکانی ژیانیشتدا لێزان بە، بیچێنەو بژاربکەو بیچنەرەوە، گرنگ ئەوەیە ئاگات لە وەرزەکانی ژیانت بێت، چونکە هیچ کامیان هەتا سەرنییەو دێنو دەچن، ئەوەشت لە یاد بێت بۆ هەر وەرزێك کارێك هەیە، هەموو وەرزەکان هی تۆنو تۆش بێ نازیان مەکە، زۆر بەدڵنیایی ئەگەر ژیرانە کارت تیاکردن، ئەوە سەرکەوتن لەمشتتدایە.



# پۆستی ناخو پۆستی دەست

شاخەوان جەبار

سروشتی زۆرێك لە مرۆڤەكان بە جۆرێك هەڵكەوتووە كە هەڵپەكردن بۆ دەسەڵات بووە بە نیشانەی دیاریكراوی ویستەكانیان، دەكرێت هەندێك لەو مرۆڤانەش ئەم هەڵوێستەیان لە خەمخۆرییەوە بێت بۆرزگاربوون لەو بارودۆخە ناهەموارو چەقبەستووەی كە بەرۆكی گرتوون، چ لە ڕووی ژینگەو چ لە ڕووی كەسەكانەوە، كەسی دی شك نابەن بە هەموو پێوەرەكان بۆ ئەو ساتە گونجاوبێت لە بری ئەوان، واتە لەو دەمەدا وەك فریادڕەسێكن، بەڵام بەشی زۆری ئەوانەی كە هەموو هەمووخەمێكیان تەنها بە دەستهێنانی پۆستی دەستە، كە كورسی تەختی دونیایان بۆ دێنێتە بوون، ئەوانەن كە دونیاویستو بەرژەوەندی خودخوازنو تەنانەت لەو پێناوەشدا زۆرشتی بۆ دەكەنە قوربانی، تاسەرەنجام بەو پۆستە ویستراوە بگەن، لە ڕاستیدا ئەم جۆرە بیركردنەوەیان لەوەوە سەرچاوە دەگرێت كە تەنها بە دوومەبەست لە پۆستی دەست تێگەیشتوونو بەس ئەوانیش:

یەكەم: خۆناساندن، واتە ئەم پۆستە وەك هەلێكو هۆكارێك دەزانن لەو ساتەدا بۆ خۆناساندنی خود، ئەگەرچیش توانای كەسێتیان شایستەی ئەوكورسییە نەبێت، چ لە وتەو چ لە كرداریاندا.

دووەم: بە دەستهێنانی ماددە، هەموو هەوڵو كۆششێكیان لەو ساتەدا ئەوەیە خەیاڵ چی دەخوازێتو گیرفان چی دەگرێت، پۆست چی لە ژێردەستە پێكەوە گرێی بدەنو لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیان بەرجەستەی بكەن، بێ ڕەچاوكردنی عەقڵو ویژدانو یاساو ڕێسای مرۆییو ئاسمانی.

كەمن ئەو مرۆڤانەی كە بە بیرو كرداریان دژی ئەوانەن كە پۆست لەو دووخاڵەدا كورت هەڵبێنن. ئەمجۆرە مرۆڤانەش ئەوانەن كە دەیانەوێت پۆستی ناخ بە دەست بێنن، نەك پۆستی دەست، چونكە بەو یەقینە گەیشتوون كە تامرۆڤ نەتوانێت پۆستی ناخ بە دەست بێنێت، ئەوە هەرگیز ناتوانێت دادگەر بێتو وەك ئەوەی كە پێویستە شایستەی فەرمانڕەوایی كەسانی تر بێت.

پۆستی ناخ ئەو هێزو فلتەرەیە كە ئاڕاستەی ویستەكانی بەرژەوەندیو خۆویستی مرۆڤ لە هەڵپەوە بۆ ئەرك كۆنترۆڵ دەكاتو لە بری ئەوان هێزی خودسازیو خۆنەویستی مرۆڤ دەخاتە جوڵەو بە ئاڕاستەی مرۆڤبوون لە ژیاندا ئاڕاستەی دەكات تا سەرەنجام مرۆڤێكی هەست بە بەرپرسیارێتی لە ژیاندا دێنێتە بوون.

كەسانی خاوەن پۆستی ناخ ئەو كەسانەن كە بەمرۆڤبوون گەیشتوون، واتە بە كردەیی كەسانێكی خاوەن ئاینو مامەڵەی ئاكارو ڕەوشتین، ئەو ئاینەی، یان ئەو یاسایانەی مرۆڤ كە تێڕوانینی بۆ پۆست بەرپرسیارێتییە نەك خۆدەرخستنو كۆكردنەوەی ماددە، بۆیە بەرزترینو بە بەهاترین پۆستی دونیا لە ئاست ئەو ئاسوودەییەی كە بە پۆستەكانی ناخ بە دەستی هێناوە هەرزان بەها دەكات.

لە پۆستی دەستدا، كەسەكان بێ ئۆقرەو ئارامن هەرچەندە خۆبەزلزانو لە پۆستی باڵاشدابن، چونكە هەمیشە ئەو پلەیەی پۆست بە كەم دەزاننو چاویان لە بەرزترو گەورەترە، بەڵام لە پۆستی ناخدا كەسەكان دەوڵەمەندن لە لێبوردەییو هەست بە بەرپرسیاریو ئاسودەیی، ئاسودەن، چونكە ئەمانە لە جیهانی خەیاڵەوە بە كاری هونەر هەموو ئاستەكانی پۆستی دەستیان بە دەستهێناوە، هەر بۆیە ئاسوودەن، بەڵام ئەوانی دی بەم كارە نامۆن دوو بنەماكەی تریان لەبەرچاوە.

بۆیە لە سۆنگەی ئەوەوە پێویستە ئێمە هەوڵی بەدەستهێنانی پۆستی ناخ بدەینو دواجار گەر پۆستی دەستیشمان پێ سپێردرا، ئەوا پێویستە لە ژێر هێزی پۆستی ناخدا ئاڕاستەی بكەینو بەڕێوەی بەرین، تاسەرەنجام وەك ئەوەی كە پێویستە هەبێت هەبین.





# پەیامت چییە لە ژیاندا؟

ئا: ڕێگەرد فارس

دەزانم ڕۆژێك ئەو گەوهەرەی بەدوایدا وێڵم دەیدۆزمەوە، هەرچەندە هەوڵم نەداوە بە دوایدا بگەڕێم، بەڵام ئەگەر چنگم کەوت هیچ هەست بە بەختەوەری ناکەم، چونکە گەوهەری ڕاستەقینە ئەوە نییە بێ ماندووبوونو هەوڵدان بە دەستی بهێنین، بەڵکو ئەوەیە کە بەهزری خۆمانو دەستی خۆمان بیهێنینە بوون، ئەوەش ئەو گەوهەرەیە کە هەرگیز لە کیس ناچێتو بۆ چەندین سەدەش لە ئارادا دەبێتو دەمێنێتەوە کە نەوەکانی دوای ئێمە بە ناوی باوانیانەوە دەربارەی دەدوێنو باسی لێوە دەکەن...

ئێمە بۆ ئەوە لە دایك بووین هەتا پەیامێك بگەیەنین، پەیامێك بێت بگاتە جیهان... پەیامێکی نوێ بێت بۆ داهاتوو کە جێپەنجەی منو تۆشی تێدا بێت بۆ نەوەکانمان، سەیری ڕابردوو ناکەم بۆ چارەسەری ئەو کێشانەی هاتوونەتە ڕێ، چونکە سەختیو نارەحەتی لە چارەسەرو تێگەیشتنی ڕابردوودا دەبینم، بەڵام دەتوانیت بە ئاسانی شیکاری داهاتوو بکەین، داهاتوو بەو مانایە نا کە واز لە ئەمڕۆ بهێنین بۆ داهاتوو، بەڵکو چاکسازی ئەمڕۆ دەکەم بۆ گەیشتن بە داهاتوویەکی پرشنگدار...

هەرگیز سەرکەوتن بەدەست نایەت کە تۆ لەماڵەوە دانیشیتبیت، یان لە جێگەکەتدا خەونی پێوە ببینیت، بەڵکو بە لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونو لێبڕانو هەوڵدان دەبێت، متمانە بوون بە خود کە دەتوانیت بۆ پێکهاتنی ئامانجو بەدیهێنانی ئەو ئامانجە کە خۆت دیاریت کردووە نەك ئەوەی هاوڕێو خزمو کەسو کار دیاری بکات.

چەند کات لە تەمەنت دەڕوات بێ ئەوەی هیچ جیاوازییەك لە ئەمڕۆو دوێنێتدا هەبێت، بێ ئەوەی درك بەوە بکەیت کە کاتی ئەوەیە خاوەنی پەیامێك بیتو بیگەیەنیت کە ناوی خۆتی هەڵگرتبێت...

ئەگەر بپرسم پەیامت چییە لە ژیاندا؟

ئامانجت چییە لە ژیاندا؟

گرنگترینی ئەو پرسیارانەن کە لێمان دەکرێنو بەرەو ڕوومان دەبنەوە، لەبەرئەوەی کەسی خاوەن پەیام، مرۆڤێکی مەزنە. ئەو پەیامەی دەیگەیەنێت، ڕۆڵێکی گرنگ لە ناو تاکەکانی کۆمەڵدا دەگێڕێت، کەسێك کە خاوەنو هەڵگری پەیام نەبێت، بە مرۆڤێکی ئاوارە دادەنرێت، بە پێی ئەو مێژووەی پاش خۆی پێکی دەهێنێت!

**بەم پێییە کەسەکان پۆلێن دەکرێن بۆ چوار بەش:**

یەکەم: کەسێك تەنها خاوەنی پەیامە:

بە باشی ڕێگەی خۆی دەزانێت بەڵام پلانو ئامانجی نوسراو (ئامانجی ڕوون)ی نییە، کەسانی باشو سەرکردەو پەروەردەکارن، بەڵام ڕوون نین لە هێنانەدی پەیامەکەیان، ئەم کارە زیاتر هەندێك بانگخوازو بە تەمەنەکان پەیڕەوی دەکەن، ئەگەر پلانێکی ڕوونیان هەبێت دەبنە کەسێکی بەهێز، (باوەڕداری بەهێز باشترو خۆشەویسترە لە باوەڕداری لاواز).

دووەم: کەسێك خاوەنی ئامانجو پەیامە:

ئەمانە ڕێگەی خۆیان باش دەزاننو پلانی ڕوونو ئاشکرایان هەیەو لەسەری دەڕۆن، کەسانێکی بەختەوەرن، بەهێزو سەرکەوتوو مەزنن، وەك پەیامبەران، هەروەها ئەو سەرکردانەی کە کۆمەڵگەیان گۆڕیوەو کاریگەری ئەرێنیان لەسەر کردووە.

سێیەم: کەسێك خاوەنی ئامانجە بەبێ پەیام:

کەسانێکن دەزانن چیان دەوێت، ئەوانەن کە کار دەکەن لە شوێنی گشتیو دەزگا بازرگانییەکان دا ئامانجیان دەستکەوتی ماددیە بە تەنها، ئەوانە سەرکەوتوو دەبن بەڵام بەختەوەر نابن.

چوارەم: کەسێك ئامانجو پەیامی نییە:

کەسانێکن هیچ شتێك دەربارەی ژیانیان نازانن، تەنها کەسانی تر دەیانخولقێنن، یان ئاڕاستەی ژیانیان بۆ دیاری دەکەن بەو شێوەیەی کە دەیانەوێت، نەك بەو شێوەیەی کە خۆیان دەیانەوێت.

ئەوانەن کە وێڵبوون لە گەڕان بە دوای ژیانو بەختەوەریدا، خۆشیان نازانن چییان دەوێت، هەموو ساتێکیش لە نارەحەتیو ناخۆشیدان.

حەکیمێك دەڵێت: «ژیان هیچ نرخێکی نییە، ئەگەر تیایدا شتێك، یان پەیامێك نەبێت لە پێناویدا هەوڵ بدەین».

و: ئەسکەندەر ڕەحیم



# م.د = مەڕدز

لە دێـر زەمانداو لە شـارۆچکەیەکی چەپەکدا دوو برا هەبوون، دەسـتیان دایە لانی بێعاریو دەسـتیان بـە دزینی مەڕی هاومالەکانیـان کـرد. ئەمـە لـە کاتێکدا لەو ناوچە دوورەدەسـتانەدا، مەڕدزین بە تاوانێکی گەورە لە قەڵەم دەدراو سزایەکی توندی بۆ دانرابوو.

ڕۆژێکیان جووتیارەکانی شارۆچکەکە، بەسـەر دزێتـی دوو دزەکـەدا کەوتـنو قۆڵبەسـتیان کردنو هەمـووان بڕیاریان دا: تەختی تەوێڵی هەردوو براکە، بە دوو پیتی «م، د» کە مانای مەڕدز دەگەیەنێت، بـە جۆرێـك داخ بکەن، تا دواهەناسـەی ژینیـان ئەم نیشـانەیان پێوە بێتو لێیان نەبێتەوە!

یەکێك لەو دوو برایە، بە هۆی نەخشی ئەم نیشانەیەوە، هەستی بە شەرمەزاریو ڕووزەردییەکی لەڕادەبەدەر کرد. لە ئاکامدا بڕیاریدا، ئەو شارۆچکەیە بە جێبهێڵێتو سەری خۆی هەڵبگرێت.. ئیدی هیچ کەس هەواڵی لێی نەما.

هەرچـی بـرای دووەمیـش بـوو، پەشـیمانییەکی وەهـا دایگـرت، کـە لە بـاس نایەتو بڕیـاری قەرەبووکردنەوەی ئـەو هەڵانـەی دا، کـە بەرامبـەر مافی جووتیارەکان ئەنجامی دابوون.

جووتیـارەکان لـە سـەرەتادا لێـی بە گومـانو دڕدۆنـگ بوونو لێـی دوور دەکەوتنـەوە.. بەڵام ئەم کاکەیە لەسـەر قەرەبووکردنەوەو چاککردنەوەی هەڵەکانی ڕابردووی، زۆر پێداگر بوو.. ئەم ڕەفتارەی جووتیارەکان دڵسـاردی نەکردەوەو ورەی دانەبەزاند.. بەڵکو کاتێك یەکێك نەخۆش دەکـەوتو لە جێگەدا دەکەوت.. مەڕدزەکە سەردانی دەکردو بە بڕێك شۆرباو دیاریو چەند وشـەیەکی پڕسـۆز، دەسـتباری بۆ کۆڵـی سـەنگینی نەخۆشـەکە دەگـرت. هەرکەسـێکیش پێویسـتی بـە هـاوکاری دەبوو، مەڕدزەکە دەستی یارمەتی بۆ کێش دەکـردو بە بـێ جیـاوازی یارمەتی داراو نەداری دەدا.. سەرباری ئەوەش لە هەمبەر ئـەو کارانەیـدا، داوای هیـچ بەرامبـەرو پاداشتێکی نەدەکرد.

ساڵان هاتو ڕۆیشت، ڕێبوارێك بە لای شـارۆچکەکەدا ڕەتبـوو، لـە چایخانەکەی ئەوێ لایدا، تا تاوێك بحەوێتەوەو نیوەڕۆژە بکاتەوە.. لە تەنیشت پیاوێکەوە کە ئاگری پیری بە تەواوی لەسەری بەربووبوو، دانیشت.. تەختی تەوێڵی ئەم پیرە بە ساڵاچووە، بە نیشانەیەکی سەیر داخکرابوو.

خاڵـۆی ڕێبـوار سـەرنجی دا.. هـەر کەسـێك لە دانیشتووانی ئەم شارۆچکەیە، کـە بـە لای ئەم پیـرەدا تێپـەڕ دەبێت، ڕادەوەسـتێتو لەگەڵیـدا دەدوێت، یاخود ڕێزو خۆشەویسـتی خۆی بۆ دەردەبڕێت.. هەروەهـا منداڵەکانی ئەوێ ڕادەوەسـتان، تـا پیرە پیاوەکە لە ئامێـز بگرن، یاخود ئامێزی گەرمی خۆی بۆ ئەوان بکاتەوە.

خاڵۆی ڕێبوار هەسـتی زانین گوشاری بۆ هێناو لە چایچییەکەی پرسـی: (ئەرێ کاکـە، بە ئەرك نەبێـت پێم ناڵێیت، ئەم جێداخە سـەیرەی لە تەختی تەوێڵی ئەم پیرەدایە، مانای چییە؟!)

کابـرای چایچـی لە وەڵامیـدا گوتی: (ببەخشە کە نایزانم، بەڵام ئەوەندەی من بزانم، ئـەم جێداخە بـۆ دەمێکی دێرین دەگەڕێتـەوە).. پاشـان چایچـی بۆئەوەی بیربکاتـەوە، کەمێـك بێدەنگ بوو، دواتر گوتی: (هەڵبەتە منو گشـت دانیشتووانی ئەم شـارۆچکەیە وای بۆدەچین، ئەو دوو پیتـە «م. د» کـە لە تەختـی تەوێڵیدا داخ کـراوە، مانـای مـەردی دەسـپاك دەگەیەنێت!!!)

سەرچاوە: هل فات الأوان؟
باسل شیخو

و: لە ئینگلیزییەوە:
پشتیوان موبارەك كەریم




# ٩٨ کلیل بۆ سەرکەوتن

١- ئامانجی ژیانی خۆت دیاری بکەو ژیانت بۆ هێنانە دی ئەو ئامانجە تەرخان بکە.

٢- زۆر بە وریایی‌و زیرەکانە هاوسەری ژیانت هەڵبژێرە.

٣- لاوازترین‌و بەهێزترین خاڵەکانت بزانەو هەردوکیشیان چاکتر بکە.

٤- هاوڕێی باش بدۆزەرەوە کە هەمان ئاڕاستەو دیدو تێڕوانینتان هەبێت، چونکە هاوکاریت دەکات بۆ گەیشتن بە ئاواتەکانت، پێش ئەوەی کات بەسەر بچێت.

٥- هاوسەنگی نێوان باری دارایی، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، تەندروستی، لایەنی دەروونی‌و ڕۆحی‌و بەختەوەری بپارێزە.

٦- ئەو ڕاستییە بزانە کە چۆلەکەیەکی نێو دەستت باشترە لە دووچۆلەکەی سەر درەخت.

٧- بزانە لە چ بوارێکدا گەشە دەکەیت‌و ئاسۆی بیرکردنەوەو داهێنانت فراوان دەبێت.

٨- ئەو ڕاستییە بزانە کە تۆش هەموو ئەو تایبەتمەندیانەت هەیە کە مەزنترین کەسانی مێژوو هەیانبووە.

٩- ڕۆژانە باشترین جل‌وبەرگ لەبەربکە، هەمیشە جوان پۆش‌و خۆشحاڵ دەرکەوە.

١٠- ئەو ڕاستییە بزانە کە بیر لە هەر شتێك بکەیتەوە بتوانیت، یان نەتوانیت، تۆ هەرشایستەی بیرکردنەوەیت‌و مافی بیرکردنەوەت هەیە.

١١- لە قەرزکردن دوورکەوەرەوە کە وەك پەتایەك هەمیشە بێزارت دەکات.

١٢- زیاتر پاشەکەوت بکە، وەك لەوەی خەرجی دەکەیت.

١٣- لە ڕێگاکانی وەبەرهێنانی دارایی بکۆڵەرەوەو شارەزایان بە.

١٤- هەمیشە کاری سودبەخش‌و بەرهەمدار ئەنجام بدە، لە ڕێگەی کتێب‌و پەروەردەو ڕۆشنبیرییەوە.

١٥- زیاتر گوێ بگرەو کەمتر بدوێ.

١٦- ئەگەر توانای داراییت باشە، خزمەتکارێك ڕابگرە.

١٧- کاروباری داراییت ژیرانە ئەنجام بدە.

١٨- موڵك‌و کاروبارەکانت هەمەجۆر کە.

١٩- زاڵبە بەسەر پێنج لە خراپترین خووەکانت، پاشان پێنجی تر.

٢٠- باشترین مامۆستای خۆت بە، باشترین هەوڵ‌و کۆششی خۆت بدە لە ژیانتدا.

٢١- نرخ‌و بەهای دروستی دارایی خۆت بزانە.

٢٢- بە هەستکردن بە لێپرسراوییەوە بژی، هەرگیز ئاکارو ناوبانگی خۆت لە کەدار مەکە.

٢٣- هەموو ڕۆژێك خوازیاری پێگەیشتن بە.

٢٤- پلان بۆ ڕۆژانەو بۆ هەموو ژیانت دابنێ.

٢٥- ڕاوێژکارو ئامۆژگارێکی دڵسۆز بدۆزەرەوەو کە هاندەرت بێت بەرەو گۆڕان.

٢٦- شوێن خەون‌و ئاواتەکانت بکەوەو گرنگی بە حەزو ئارەزووەکانت بدە.

٢٧- لەگەڵ خەڵکی نامۆدا میهرەبان بە.

٢٨- لە هەموو ئەو کەسانە ببورە کە زویریان کردوویت.

٢٩- خۆشەویست‌و میهرەبان‌و سەرنجڕاکێش بە.

٣٠- هەرگیز بیر لە بیرۆکەی خراپ‌و نەرێنی مەکەرەوە.

٣١- هەر ڕۆژێك چارەسەری شکست‌و تێکشکانێکت بکە.

٣٢- هەموو ساڵێك مۆڵەتێك وەرگرەو پشوویەك بدە، یان گەشتێك بکە.

٣٤- زۆر خەمخۆری ئەو کەسانە بە، کە خەمخۆری تۆن‌و دڵسۆزتن.

٣٥- لە هەمانکاتدا کەسێکی کۆڵنەدەرو وریاو زیرەك بە.

سەرچاوە: www.mrselfdevelopment.com

# بۆئەوەی بە تەندروستی بژین

ئا: ئالانی




خوێنەرانی ئازیز، کورد لە مێژە گوتوویەتی: (خۆپاراستن باشترە لە چارەسەر کردن)، هەر بۆیە لە بابەتی ئەمجارەماندا ئەم چەند خاڵە دەخەینە بەر دیدی ئێوەی زێدەئازیز، بەو هیوایەی بتوانین لە ژیانی رۆژانەماندا هەریەك لەم خاڵانە پیادە بکەین، لە پێناو بە دەستهێنانی ژیانێکی تەندروستو ئارامو ئاسوودە:

١- قاوەکەت مەخۆرەوە تا سارد دەبێتەوە: قاوە، یان هەر خواردنەوەیەکی گەرم بۆ وێنە: چا، شیر، نیسکافە... هتد، بە گەرمی مەخۆرەوە، چونکە ئەگەری تووشبوون بە نەخۆشی شێرپەنجەی دەمو سورێنچك زیاد دەکات، باشتر وایە کوپەکەت دابنێی تا کەمێك سارد دەبێتەوە.

٢- زۆر بە باشی خواردنو سەوزەوات بجوو: کرداری جوین بە باشی لە کاتی خواردنی سەوزەدا بۆ نموونە: کەلەرم، برۆکلی، قەرنابیت، سپێناغ.. هتد، دەبێتە هۆی زیادبوونی رێژەیەك لە ماددەی کیمیاوی، کە دەبێتە هۆکاری پاراستنت لە نەخۆشی شێرپەنجە.

٣- رۆیشتن بە پێ، رۆژانە پیادە رۆیی بۆ ماوەی کاتژمێرێك، یان نیو کاتژمێر، دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ئەگەری توشبوون بە نەخۆشی شێرپەنجە بە رێژەی لە ١٨٪، هەروەها دەبێتە هۆکاری رزگاربوونت لە کێشی زیادەی لەش، لانی کەم ساڵانە سێ کیلۆگرام دادەبەزیت، لەگەڵ ئەوەشدا پیادەرۆیی پارێزگاری لە بەهێزبوونی جەستەت دەکات.

٤- چواڵە زۆربخۆ: لە نێوان ژەمەکاندا، یان لە کاتی هەستکردن بە برسێتی، چواڵە بخۆ، چونکە چواڵە دەوڵەمەندە بە توخمە خۆراکییەکان، کە جەستە پێویستی پێیەتی.

٥- دارچینی بکەرە نێو قاوەوە، نیو کەوچکی بچووك لە دارچینی بکەرە نێو کوپێك قاوەوە، دەبێتە هۆی دابەزینی کۆلیسترۆڵ لە خوێندا، هەروەها یارمەتی جەستە دەدات لە بەکارهێنانی ئەنسۆلیندا بەشێوەیەکی چالاکتر.

٦- بەردەوام بە لەسەر وەرزشکردن: وەرزشکردن کاردەکاتە سەر چالاککردنی سوڕی خوێن، هەروەها ئەگەری تووشبوون بە نەخۆشییەکانی جومگەو بڕبڕەی پشت کەمدەکاتەوە، جگە لەوەش پارێزگاری لە بەهێزبوونی جەستە دەکات.

٧- لە کاروبارەکانتدا پەلە مەکە: مرۆڤ بەشێکی زۆر لە کاتەکانی بۆ راپەراندنی کاروبارەکانی رۆژانەی بەکاردەهێنێت، ئەم پەلە کردنەش دەبێتە هۆی دووچار بوون بە بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

٨- لە نێوان ژەمە خۆراکەکاندا بنێشت بجوو: شارەزایان ئامۆژگاریمان دەکەن بە جوینی بنێشت لە نێوان ژەمە خۆراکییەکاندا بە مەرجێك شەکری تێدا نەبێت، بە تایبەت کاتژمێری دوای نانخواردن، ئەمەش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی نیشانەکانی ترشانی گەدە.

٩- خواردنی سەوزەو میوە بخۆ: هەموو رۆژێك ٣ جار سەوزەو میوە بخۆ، ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ئەگەری تووشبوون بە نۆرەی دڵ بە رێژەی لە ٧٠٪.

١٠- لە بری شەکر هەنگوین بەکاربهێنە: بۆ شیرین کردنی چا، یاخود شیر، لە بری شەکر برێکی کەم هەنگوینی سروشتی بەکاربهێنە، سەرەرای رزگاربوونت لە زیانەکانی شەکر کە بە ژەهری سپی ناسراوە، دەبێتە هۆی بەهێزبوونی بەرگری جەستەو نەهێشتنی میکرۆب.

١١- چاویلکەی دژە خۆر بەکاربهێنە، پێویستە چاویلکەی دژە خۆر بەکاربهێنیت، کە پارێزەرێکی باشە لە تیشکی خۆرو تیشکی سەرو وەنەوشەیی، کە دەبێتە هۆی تووشبوون بە تارماییەك لەسەر گلێنەی چاو، یاخود کوێربوون لە تەمەنی پیریدا، لەبەرئەوە هەر کات جوویتە بەرتیشکی خۆر چاویلکەی دژە خۆر بە کاربهێنە، لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیابە لە باشی جۆری چاویلکەکەت.

١٢- خەوتن بە شێوەیەکی باش: خواردنی سێو بۆ نەهێشتنی بێ خەوییو خەوتن بە شێوەیەکی قوڵ، چونکە خەوتن بەشێوەیەکی باش دەبێتە رێگر لە پیربوونی پێش وەخت، هەروەها پارێزگاری لە مانەوەی رووخسارت بە لاوێتی دەکات.

١٣- چای سەوز بخۆرەوە: شارەزایان ئامۆژگاریمان دەکەن کە رۆژانە کوپێك چای سەوزبخۆینەوە، دەبێتە رێگر لە بە ئۆکسانبوونی خانەکانی جەستە، هەروەها ئەگەری تووشبوون بە نەخۆشی شێرپەنجە کەم دەکاتەوە.

١٤- هەفتەی جارێك ماسی بخۆ: هەرچەندە پسپۆرانو شارەزایان ئامۆژگاریمان دەکەن لە هەر هەفتەیەکدا دووجار ماسی بخۆین، لەگەڵ ئەوەشدا خواردنی ماسی یەکجاریش لە هەفتەیەکدا دەتوانێت یارمەتیت بدات لە سەر چاککردنی هاوسەنگی ماددە مۆخییە کیمیاییەکان، هەروەها ماسی زۆر بەسوودە بۆ تەندروستی مۆخ و دڵ.

١٥- شتی قورس هەڵمەگرە: دوور کەوەرەوە لە هەڵگرتنی کەلوپەلی قورس، بۆئەوەی کاریگەری لەسەر بڕبڕەی پشتت، یان لە شێوازی وەستانو رۆیشتنت بە شێوەیەکی خراپ نەبێت.

١٦- ئاگاداری رەنگی زمانت بە: رەنگی زمان ئاماژەیە بۆ گرفتی تەندروستی، لەبەرئەوە بەردەوام چاودێری رەنگی زمانت بکە، بۆ نموونە رەنگی سپی، بەڵگەیە لەسەر لاوازی کۆئەندامی بەرگری، رەنگی زەرد بەڵگەیە لەسەر زۆر خواردنو خواردنەوە، رەنگی سور، ئاماژەیە بۆ ماندووبوونی دەروونی.

١٧- گەشتو گوزارو چوونەدەرەوە: گۆرانکاریو چوونە دەرەوەو گەشتوگوزار، یارمەتی وەرە بەرزکردنەوەو دوورکەوتنەوەت لە دڵەراوکێو خەمۆکی .. هتد، دەدات، کەواتە پێویستە بەرنامەیەکی باش ئامادە بکەیت، بۆ گەشتکردن بۆ دەرەوەی ماڵو سەردانی دۆستانو کەسوکارو هاوڕێیانت.



پەری شێخ کەریم

خێزانی بەختەوەر

# لێکجیابوونەوەی هاوسەرانو کاریگەری لەسەر منداڵ

**لێکجیابوونەوەی هاوسەران پەیوەندی هەیە بە دەروونی منداڵەوە؟**

لە ژمارەی ڕابردوودا باسی لێکجیابوونەوەی هاوسەرانمان کرد، پاشان ئەو هۆکارانەی کە دەبنە لەناوچوونی خێزان، چونکە لێکجیابوونەوە بە کێشەیەکی کۆمەڵایەتیو دەروونی دادەنرێت، کە ڕووبەڕووی هاوسەران دەبێتەوە، کاریگەری دەبێت بۆ سەر ژیانی هەردوولا بەتایبەتیش بۆ منداڵ، چونکە منداڵ بەشێکی سەرەکییە لە خێزانداو هەموو ئەو کێشەو ناکۆکییانەی کە دوچاری خێزان دەبێتەوە، بە هەمان شێوە کاریگەرە بۆ سەر منداڵ، لەوانەیە هەندێجار نەتوانێت بۆچوونو هەستی خۆی دەرببڕێت، بەڵام لایەنی دەروونیو هەڵسوکەوتی دەریدەخات کە لێکجیابوونەوەی دایکوباوکی ئاسوودەیی لە ناوبردووە.

دەروونناسان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن، کە تەنها قوربانییەك لە دابڕاندا منداڵە! چونکە لە لای دایکی بژی، یا لای باوکی، هەست بە نەبوونی ئەوی تریان دەکات، ئەگەر بخرێتە لای کەسوکاری دایکی، یا باوکی، بە هەمان شێوە منداڵێکی کەمتەرخەمی لێدەرچێت لە هەموو بوارێکدا، چونکە کاتێك منداڵ لە نێو باوەشی خێزانێکدا گەورە دەبێت کە پێکهاتبێت لە دایكو باوكو سۆزوخۆشەویستی، زۆر زەحمەتە کاتێك دەچێتە نێو باوەشی خێزانێکی دابڕاو کە دایكو باوکی بوونیان نییە، لە ناخیدا تووشی ململانێ دەبێت، ڕقو قینی بەرامبەر دایكوباوکیو هەموو کەسانی دەوروبەری لە لا دروست دەبێت، چونکە ئەم ڕووداوە دەروونی تێك دەداتو بە توڕەییو ڕق دەریدەخاتو پاشان بە هۆی زۆر بیرکردنەوەی لەم ناکۆکییەی دایكو باوکی زیرەکیو بیرکردنەوەی ئەو منداڵە دەگۆڕێت.

دەروونناسان ڕوونیان کردووەتەوە، زۆرێك لەو منداڵانە لە بواری خوێندندا سەرکەوتوو نابنو هەمیشە خەیاڵاوین.

لەم ژمارەیەشدا بە پێویستم زانی باسی ژیانی ئەو منداڵانە بکەم کە بە هۆی لە یەکجیابوونەوەوە ناخۆشیو بێزاری بووەتە میوانیان، ئەمانەو چەندەها چیرۆکی تر کە ڕۆژانە دەیبیستین، ئایا منداڵی دراوسێمانە، یاخود هاوڕێمانە، یا خزمو هەرکەسێکی تر، زۆر دڵتەنگ دەبین بۆیان، باچیتر بە هۆی بێئارامیو نەزانینەوە لانەی منداڵەکان نەشوێنرێت، ئەم چیرۆکانە ببنە ئامۆژگارییەك بۆ ئەو هاوسەرانەی کە لێکجیابوونەوە بە چارەسەری کێشەکانیان دەزانن.

چیرۆکی یەکەم: باوکێك خۆی قسە دەکاتو باسی ژیانی منداڵەکەی دەکاتو دەڵێت: دوای لە یەکجیابوونەوەمان لەگەڵ خێزانمدا، بۆ جارێکی تر هاوسەرگیریم کرد، هەر لە سەرەتاوە وابیرم دەکردەوە دەتوانم بۆ جارێکی تر دڵی منداڵەکەم بگۆڕمو ئاسوودەی بکەم، بەڵام هەمیشە لە هەڵسوکەوتو وتەکانیدا دەردەکەوت بێزارەو هەست بە تەنیایی دەکات، چونکە لەم خێزانەم منداڵمان هەیە، ئەو بایەخدانو خۆشەویستییەی بۆ منداڵەکەی هەیەتی، بێگومان ناتوانێت بۆ ئەوی دەرببڕێت، هەمیشە وەك منداڵێکی کەمتەرخەمو بێناز دێتە پێش چاو، بۆیە داوا دەکەم لە هەموو هاوسەرێکی بەڕێز بەخێرایی بڕیاری لە یەکجیابوونەوە نەدەن، زۆرجار وابیر دەکەنەوە خۆ ڕزگارکردن چارەسەرە بۆ کێشەکان، بەڵام بەداخەوە کاتێك خاوەن منداڵن، سەرەتایەکە بۆ هەموو ناڕەحەتییەکان، منداڵ کاتێك کە بچووکە دەڵێن پێویستی بەدایکییەتی، بەڵام هەتا ئەو ڕۆژەی بوونی هەیە لە ژیاندا بە دایکییەوە جوانە، بە تەباییو خۆشەویستی خێزانەکەیەوە سەربەرزە، بۆیە داواتان لێدەم با داهاتوویەکی جوان بۆ منداڵەکانمان دروست بکەین، نەك هەمیشە بیر لە کێشەو ناخۆشییەکانی خێزانەکەیان بکەنەوە.

چیرۆکی دووەم: (ئافرەتێك باسی ژیانی منداڵەکەی دەکات پاش ئەوەی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا جیابوونەتەوە، دەڵێت: ناخۆشترین ڕووداو بوو کە بەسەرمدا هات نەك تەنها لەبەر خودی خۆم بەڵکو لەبەر کوڕەکەم، هیچ کات باوەڕم نەدەکرد کە بەو شێوەیە لێکجیابوونەوەمان کاریگەری هەبێت بۆ کوڕەکەم، هەست دەکەم هەمیشە

بێزارە، باوەڕ بە هیچ کەسێك ناکات، حەز بە هاوڕێیەتی کەس ناکات، لە بواری خوێندندا زۆر گـۆڕاوە، هەموو مامۆسـتاکانی دەڵێن: ئەم کێشـەیە کاریکردووەتە سەر دەروونو هەڵسوکەوتی، بەردەوام هەوڵدەدەم لەگەڵیدا بێسوودە، بەڕاستی کوڕەکەم بوو بە قوربانی ئەم دابڕانە.

لـە کۆتاییـدا داوادەکـەم لـە هەموو ئافرەتێـك کاتێك کێشـەیەك چارەسـەری هەیە، داوای لەیەکجیابوونەوە نەکات، بەڵکو ئارام بگرێت لەسـەر هەندێك کەموکوڕیو ناڕەحەتی).

دوا ئامۆژگاریـم بۆ ئـەو ئافرەتەی کە لـە هاوسـەرەکەی جیابووەتـەوە با لەلای منداڵەکەی بە خراپە باسـی باوکی نەکات، هەمیشـە هانی بدات سەردانی باوکی بکات، یا بە تەلەفۆن هەواڵی بپرسێت، نەك ڕێگای لێبگرێت، بە هەمان شـێوە پێویستە لەسەر هەموو هاوسـەرێك کاتێك لە لای خۆیەتی باسـی دایکی بۆ نەکات بە خراپەو ڕێگا بە منداڵەکەی بدات کە سـەردانی دایکی بکات، بـە جۆرێـك مامەڵـەی لەگەڵدا بـکات کە لایەنی دەروونی چاك بکرێت.

داواکارم لە خودای مەزن کە خێزانەکان دووربـن لە هەموو کێشـەو ناکۆکییەك، با ڕێنماییـە شـیرینەکانی پێغەمبەری خودا (سـەلامی خوای لێبێت) لەبەرچاو بگرینو بزانین چۆن ئامۆژگاری هاوسـەران دەکاتو دەفەرموێـت: ((خیرکـم خیرکـم لأهلـه، وأنـا خیرکم لأهلـي)) واتە: ((باشـترینتان باشـرینتانە بـۆ خێزانەکـەی، منیـش باشـترینتانم بۆ خێزانەکـەم)). لە هەمان کاتـدا ئامـۆژگاری ئافرەتـان دەکات، مژدە دەدات پێیـانو دەفەرمووێـت: ((إذا صلـت خمسـها، صامت شـهرها، وحفظت فرجها، وأطاعـت زوجهـا، قیـل لها ادخلـي الجنة من أي أبـواب الجنة)). واتـە: (ئەگەر پێنج فەرزەکەی ئەنجام بدات، مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بێت، نامووسی بپارێزێتو گوێڕایەڵی هاوسەرەکەی بکات، فەرمووی لێدەکرێت لە هەموو دەرگاکانی بەهەشتەوە)).

لـەم فەرمـوودە پیرۆزانـەوە بۆمـان دەردەکەوێت پێویسـتە هاوسـەران سەرەتا بە هەوڵـدانو چاکەکردن دەسـت پێبکات، بتوانێـت بـە چاکردنـی خـودی خـۆی هەڵسـوکەوتی بەرامبـەری بگۆڕێـت، بـە ڕێزگرتنو خۆشەویستی ژیان بەسەر بەرێت، نەك هەمیشـە هەموو بڕیارەکانو وتەکانی بـە توڕەیـی ئەنجامبـدات، خێزانێـك کە خودای مەزن ستایشی دەکاتو دەفەرمووێت:

﴿أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً...﴾.

هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو خێزانێك دەخوازم

# ژیان فێری کردم



- ژیان فێری کردم: گرنگ نییە ئێستا تۆ لـە کوێیت، بەڵکو گرنـگ ئەوەیە لەم ساتەدا تۆ ئاڕاستەت بەرەو کوێیە!

- ژیان فێری کردم: چاکترە بۆ مرۆڤ وەکو کیسـەڵ بە ڕێگایەکی ڕاستدا بڕوات، لەوەی بـە ڕێگەیەکی هەڵەدا وەکوئاسـك بڕوات.

- ژیان فێری کردم: کەسانی سەرکەوتوو، بـە خێرایـی بڕیـار دەدەنو بـە هێواشـی دەگۆڕێن، بەڵام کەسـانی شکسـتخواردوو بە هێواشی بڕیار دەدەنو بە خێرایی دەگۆڕێن.

- ژیان فێری کردم: سەرکەوتن هەموو شتێك نییە، بەڵکو حەزکردن لە سەرکەوتن هەموو شتێکە.

- ژیـان فێری کردم: پێویسـت ناکات مرۆڤ خۆی بە دەسـتکەوتەکانی بەراورد بکات، بەڵکو پێویسـتە دەستکەوتەکانی بە تواناکانی بەراورد بکات.

- ژیـان فێری کـردم: زۆربـەی کات زیانی جەنگ فێرت دەکات، چۆن لە شەڕدا قازانج بکەیت.

- ژیـان فێـری کـردم: کلیلـی شکسـتخواردن، بریتییـە لـە ڕازیکردنی هەموو ئەو کەسانەی دەیانناسیت.

- ژیان فێـری کردم: هەموو کاروبارو فەرمانەکان لە ژیاندا ڕێژەییە، دەگونجێت کارێك لای کەسـێك گەورەو بە نرخ بێت، بەڵام کەسێکی دیکە هەمان کار بە کارێکی سـادەو ساکار سـەیر بکات، هەموو شتێك پەیوەستە بە ئامانجەوە، بۆ نموونە ئەگەر مرۆڤێـك بەرنامەو پلانی دانـا تەنها بۆ ئـەوەی بژێوییەکی باش بـۆ منداڵەکانی بـە دەسـت بهێنێـت، سـەرەنجام توانی سەرکەوتوو بێت لەو کارەیدا، ئەوە کەسێکی سەرکەوتووە، بەڵام ئەگەر مرۆڤێکی دیکە پـلانو بەرنامـەی دانا بـۆ کردنەوەی ٤٠ کۆمپانیا، سـەرەنجام توانـی ٣٠ کۆمپانیا بکاتەوە، ئەوە کەسێکی شکستخواردووە، بە بەراود بە بەرنامەو ئامانجو پلانەکەی.

- ژیان فێری کـردم: بەختەوەری بە دەسـت نایەت لە دووریو نەبوونی کێشەو گرفتەکانـی ژیان، تەنها کاتێك بە دەسـت دێـت کـە بتوانیـت زاڵبیت بەسـەر ئەو کێشەو گرفتانەدا.

- ژیان فێری کردم: سەرکەوتن خۆی لە پشت دانانی ئامانجو پلانو بەرنامەڕێژییەوە حەشـار داوە، بـەڵام بەختـەوەری لـە خۆشەویسـتیو چێژوەرگرتنو بە دیهاتنی هیواو ئاواتەکانەوە خۆی حەشارداوە.

- ژیان فێری کردم: پێویستە لەسەرمان بڕیار نەدەین بەسـەر ئەو کەسـانەدا کە هـەوڵ دەدەنو شکسـت دەهێنـن، بەڵکو دەبێت بڕیار بە سەر ئەو کەسانەدا بدەین کە شکست دەهێنن لە هەوڵدان.



# پەیوەندی نێوان بووك و خەسوو

ئامادەکردنی
بەرزان ئەبوبەکر

(چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا دەکەیت، بە هەمان شێوە هەڵسوکەوتت لەگەڵدا دەکەن)!

گومانی تێدا نییە هەر نەتەوەیەك لەم جیهانەدا خاوەنی نەریتو کلتوری تایبەتی خۆیانن، بەڵام هەندێك نەریت وەکو ستاندەری لێهاتووەو لای زۆربەی زۆری نەتەوەکانی جیهان بوونی هەیە، بۆ نموونە بابەتی ئەمجارەمان واتە (پەیوەندی نێوان بووكو خەسوو)، ئەم نەریتە لە هەموو جیهاندا چون یەکەو دەگمەنن ئەو بووکانەی بە وێنەی دایکیان خەسوویان خۆش دەوێت، لە کاتێکدا خەسووەکانی ئەمڕۆ بووکەکانی دوێنێ بوون، بووکەکانی ئەمڕۆش خەسووەکانی سبەینێن، بەڵام ئەم دوو کەسە کە هەر لەو ساتەوەی نازناوی بووكو خەسوو وەردەگرن، ئیدی چاویان بە یەکدی هەڵنایەتو بە بینینی یەکدی خۆشحاڵ نین، هەمیشە بە چاوی ڕقوکینەوە بۆ یەکتر دەڕوانن، لەسەر شت گەلێك کە تەنانەت نرخی باسکردنی نییە، نێوانیان هەر لە مانگی یەکەمەوە تێکدەچێتو زۆرجار خەسوو ڕقەکەی بۆ کوڕەکەشی دەگوێزێتەوەو بە هۆی بووکە خانەوە کوڕەکەشی لەبەرچاو دەکەوێت.

من دڵنیام لەوەی زۆربەی ناکۆکییەکان کە ڕوو دەدەن لە نێوانیاندا شتگەلێکی زۆر سادەو سانان، بەڵام ئەم بیروبۆچوونە وایکردووە کە ئەم دووانە بە بیستنی ناوی یەکتر بێزار ببن، بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەم بابەتە پێکەوە گوێ لەم بەسەر هاتە دەگرین، تا بزانین چۆن دەتوانین ئەو ناکۆکییانە بنەبڕ بکەینو پەیوەندییەکان لە شەڕو ناخۆشیو ناکۆکییەوە بگۆڕین بۆ خۆشیو خۆشگوزەرانیو خۆشەویستی و

ئاسوودەیی:

ساڵانێك لەمەوبەر هاوسەرگیریم لەگەڵ کوڕێکی هاوپۆلی زانکۆمدا کرد، بەو مەرجەی لەگەڵ باوکیو دایکیدا بژیم...

دوای ماوەیەکی کەم بۆمدەرکەوت ناتوانم لەگەڵ دایکیدا بگونجێم، واتە: خەسووم، کەسایەتیمان زۆر لە یەکدی جیاواز بوو، خەسووم زۆر ئاکارو هەڵسوکەوتی هەبوو کە من ڕقم لێ دەبوودوە، لەسەرو ئەوەشەوە هەمیشە لە سەنگەری تۆڵەدابوو بەرامبەرم!

ڕۆژەکان تێپەڕین، ڕۆژ لە دوای ڕۆژو هەفتە لە دوای هەفتە بۆ یەك چرکەش لە مشتومڕو دەمەقاڵێو شەڕو بەگژاچوون نەوەستاین لەگەڵ یەکدیدا، توڕەییو نەبوونی بەختەوەریو نائارامی ماڵەکەی پڕ کردبوو، هۆکارەکەشی ماندووبوونی

زۆرو بەدبەختی بوو بۆ منی هەژار.

لە کۆتاییدا نەمتوانی چیدی بەرگەی هەڵسوکەوتی خراپو ناشیرینو دیکتاتۆریەتی خەسووم بگرم.

لەبەرئەوە برپارمدا کە ڕێگە چارەیەك بدۆزمەوە، بۆ ئەم مەبەستە ڕۆیشتم بۆ لای یەکێك لە هاوڕێکانی باوکم کە ناوی (مستەر هوانگ) بوو، فرۆشیاری دەرمانی گژوگیا بوو.

لە سەرەتاوە ژیانی خۆم بۆ گێڕایەوە، پاشان داوام لێکرد هەندێك گژوگیای ژەهراویم پێ بدات تا بتوانم بۆ هەتایە چارەسەری گرفتەکەم بکەم!

(مستەر هوانگ) کەمێك لەو کارە بیری کردەوە، لە کۆتاییدا پێی گوتم: من یارمەتیت دەدەم بۆ چارەسەری کێشەکەت، بەڵام دەبێت جوان گوێڕادێری بۆ قسەکانمو ئەوەی پێت دەڵێم ئەنجامی بدەیتو بە تەواوی گوێڕایەڵی قسەکانم بیت.

لە ڕاستیدا بە هاوکارییەکەی زۆر شادمان بووم، هەر بۆیە بە خۆشحاڵییەوە وتم: بە چاوان (مستەر هوانگ)، بە دڵنیاییەوە تەواوی ئەو شتانە جێبەجێ دەکەم کە تۆ پێم دەڵێیت.

پاشان (مستەر هوانگ) هەستاو ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی دواوە، دوای چەند خولەکێك گەڕایەوەو لەگەڵ خۆیدا شووشەیەکی بچووکی هێنا لەسەرشێوەی دڵۆپتکێن (قطرة)، پێی وتم: بۆ ڕزگارت بوونت لە خەسووت نابێت لە سەرەتاوە ژەهرێکی کوشندە بەکاربهێنیت کە بە خێرایی کاریگەری لەسەر دروست بکات، ئەگەر وابکەیت ئەوا گومانت لێ دەکەنو بەو تۆمەتە دەخرێیتە زیندان.

لەبەرئەوە ئەم دەرمانەت پێ دەدەم، کە هێواش هێواش کاریگەری لەسەر جەستەی دروست دەکات، بەڵام ئەوەی پێویستە لەسەر تۆ ئەوەیە کە هەموو ڕۆژێك خواردنی باشو بەتامی بۆ دروست بکەیت، بۆ نموونە گۆشتی مریشك، یان گۆشتی ڕەش، ماسی...هتد، پاشان دڵۆپەیەك لەم دەرمانە بەسەر خواردنەکەدا بکە، پێویستە ڕۆژانە لەسەر ئەم بەرنامەیە بەردەوام بیت، واتە هەموو ڕۆژێك خواردنی زۆر خۆشی بۆ ئامادە بکەیت، هەروەها هەڵسوکەوتت لەگەڵیدا بگۆڕیت، وەکو هاوڕێیەکی نزیكو بە وەفا مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت، هەرگیز دەمەقاڵەو مشتومڕی لەگەڵدا نەکەیت... لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە گوێڕایەڵی هەموو داواکاریو ئارەزووەکانی بیت، وەکو شاژنێك بۆی بڕوانەو مامەڵەی لەگەڵدا بکە... هەموو ئەمانە دەبێت لەو پێناوەدا ئەنجام بدەیت کە لە کاتی مردنیدا گومان لە تۆ نەکەن..

منیش بەم بەرنامەو پیلانە زۆر دڵخۆش بووم، بە خێرایی گەڕامەوە ماڵ، بۆئەوەی دەست بکەم بە جێبەجێکردنی پیلانەکە، بەو هیوایەی لەو ڕێگەیەوە خەسووم لەناو ببەم..

ڕۆژان هاتو ڕۆیشت، چەند هەفتەیەك، چەند مانگێك بەسەر ئەم پیلانەدا تێپەڕی، هەموو ڕۆژێك خواردنی باشم بۆ خەسووم ئامادە دەکردو دڵۆپێك لە دەرمانەکەم دەکرد بەسەر خواردنەکەیدا.

هەمیشە بیرم لە وتەکانی (مستەرهوانگ) دەکردەوە، کاتێك دەیگوت ئاگاداربە گومانت لێ نەکەن، بە تەواوی هەڵسوکەوتم لەگەڵ خەسوومدا گۆڕیو لەو ڕۆژە بەدواوە هەموو کات گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەبووم، زۆر دڵسۆزانە مامەڵەم لەگەڵدا دەکرد..

دوای تێپەڕبوونی شەش مانگ بارودۆخی ماڵەکە بە تەواوی گۆڕاو هەموو شتێك پێچەوانە بووەوە، تەنانەت خۆم بینییەوە کە هیچ کات تووڕە نەدەبووم لە دەستی خەسووم، لە تەواوی ئەو ماوەیەدا هیچ جۆرە مشتومڕێکم لەگەڵ خەسوومدا نەکرد، سەرەنجام نێوانمان زۆر خۆشبوو، زۆر بە ئاسانی لەگەڵ یەکدیدا دەگونجاینو مامەڵەمان دەکرد.

ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بە تەواوی تێڕوانینو هەڵسوکەوتی خەسووم گۆڕا، تا وای لێهات هێندەی کچەکەی خۆی خۆشی دەویستم، بەردەوام لای هاوڕێیانو نزیکانو دۆستانی باسی منی دەکردو دەیگوت باشترین ئافرەتە.

ئێستا منو خەسووم وەکو کچو دایکێك مامەڵە لەگەڵ یەکدیدا دەکەینو هاوسەرەکەشم کە دەبینێت ئەم گۆڕانکارییە گەورەیە لە نێو ماڵماندا ڕوویداوە زۆر شادمانو دڵخۆشە!

ڕۆژێکیان بە پەلە ڕۆیشتمەوە بۆ لای هاوڕێکەی باوکم (مستەرهوانگ)... پێم وت: بەڕێز (مستەر هوانگ)، تکایە ئەمجارەش یارمەتیم بدە، دەرمانێکم بدەرێ بۆ ئەوەی کاریگەری ئەو ژەهرە لەناو بەرێت کە لە ماوەی ئەم شەش مانگەدا دەرخواردی خەسووم داوە، چونکە ئێستا نامەوێت خەسووم تەنانەت پەنجەیەکیشی گەرم ببێت، بە ڕاستی ئەو زۆر گۆڕاوە، بووە بە ئافرەتێکی نەرمو نیانو لەسەرخۆ، ئێستا وەکو دایکم خۆشم دەوێت، هەرگیز نامەوێت بمرێت! تکایە، تکایە ئەمجارەشیان هاوکاریم بکە!

(مستەر هوانگ) زەردەخەنەیەکی کردو وتی: من هیچ کات ژەهرم نە بە تۆ، نە بە هیچ کەس نەداوە، ئەو شووشەیە تەنها کەمێك ئاوی پاکی تێدابوو..

تاکە ژەهر بریتییە لەو ژەهرەی کە لە مێشکی تۆ دابوو، کە بەو ئاراستەیەیدا بردیت بیر لەوە بکەیتەوە چۆن خەسووت لە ناوبەریت، بەڵام کە ئێستا مێشکت بە خۆشەویستی شۆردووە، ئیدی خۆشەویستیش لە نێوانتاندا چەکەرەی کردووە!

خوێنەری ئازیز، ئێستا تێگەیشتیت کە تۆ چۆن مامەڵە لەگەڵ دەوروبەرتدا بکەیت، ئەوانیش بە هەمان شێوە مامەڵەت لەگەڵدا دەکەن! دەتوانیت ئەم جۆرە مامەڵەیە لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەدا تاقی بکەیتەوە کە خۆشت ناوێنو وا هەست دەکەیت ڕقیان لێتە، دڵنیام بە هەمان شێوە ڕقو کینەتان دەگۆڕێت بۆ خۆشەویستیو سۆزو میهرەبانی، پەندێکی صینی هەیە دەڵێت: ئەو کەسەی کەسانی تری خۆش دەوێت، خەڵکیش بە هەمان شێوە ئەویان خۆش دەوێت.

# لە کوپی (قاوە)وە فێربە!



و: عەبدولقەهار بلباس

یەکێك لە نەریتە باوەکانی زانکۆ بیانییەکان ئەوەیە کە قوتابیانی دەرچوو لەو زانکۆیانە جارجارە سەردانی ئەو شوێنە دەکەنەوەو دانیشتنو گفتوگۆ لەگەڵ یەکترساز دەکەن، لە کاروباری ژیانی یەکتر ئاگادار دەبن.

لە یەکێك لە زانکۆکان کۆمەڵێك قوتابی دەرچوو دوای ساڵانێك لە دابڕانو جێهێشتنی کورسییەکانی خوێندن لە زانکۆکەیان، ڕۆژێك بۆ هەمان مەبەست کۆبوونەوەو پاشان سەردانی ماڵی یەکێك لە مامۆستاکانیان کرد کە پیر و بە ساڵاچوو بوو.

لە پاش تاوێك دانیشتنو پرسینی گوزەرانی یەکتری، مامۆستاکە قوتابییەکانی جێهێشتو لە ژوورەکە چووە دەرەوە. لە پاش ماوەیەکی کەم گەڕایەوە لایانو کترییەکی گەورەی پڕ لە قاوە بۆ هێنان تا پێشکەشیان بکات، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنج بوو، کۆمەڵێك کوپی لەگەڵ هێنا بە جۆرێك کە لە شێوەو ڕەنگ جیاواز بوون. هەندێك لە کوپەکان گرانبەهاو نایاب بوون، هەندێکی تریشی شووشەی ئاساییو پلاستیكو کریستاڵیشی تێدا بوو، بە شێوەیەکی گشتی هەیانبوو لە ڕووی دیزاینو ڕەنگەوە لەوپەڕی جوانیو گرانبەهاش بوون، لە هەمان کاتدا لەو جۆرانەشی تێدا بوو کە لە ماڵە زۆر هەژارەکانیشدا چنگ دەکەوتن.

مامۆستا بە ساڵاچووەکە بە قوتابییەکانی گوت: بفەرموون.. با هەر یەکێك لە ئێوە کوپێك دەست بداتیو قاوەیەك بۆ خۆی تێ بکات، ئەوانیش کوپەکانیان لە دەستگرت بۆ ئەوەی قاوەیەکی بە تام نۆش بکەن، بەڵام بەر لە خواردنەوەی قاوەکانیان مامۆستاکەیان سەرنجی شتێکی دا، ویستی لە ڕێگەی ئەمەوە وانەیەکیان لە ژیان فێر بکات، بۆیە لێیانی پرسی: (ئایا تێبینی ئەوەتان کرد کە هەر هەمووتان کوپە جوانو گرانبەهاکانتان هەڵگرتو کەس بەلای کوپە ئاساییەکاندا نەچوو؟! ئەمەش ئاساییە، چونکە هەموو کەس حەز بە هەڵبژاردنی شتە باشو نایابەکان دەکات لە ژیاندا، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەی پێویستی ئێوەیە «قاوە»یە نەوەك «کوپ»، جگە لەمەش هەمووتان چاوتان لە دەستی هاوڕێکەی بوو، تاکو بزانێت کامیان کوپی باشتری هەڵبژاردووە؟ جا ئەگەر ژیان بریتی بێت لە «قاوە» کەواتە هەموو ئەوانەی کە لە ژیانمان هەن لە کارو پیشەو سامانو پلەو پایەی کۆمەڵایەتی بریتین لە «کوپ»ەکان، کە تەنها ئامرازو دەفرێکن ژیان لە خۆ دەگرن، بەڵام جۆری ژیانەکە بریتییە لە «قاوە» کە، کە هەر ئەو دەمێنێتەوەو گۆڕانکاری بەسەردا نایەت.

جا ئەگەر تەرکیز تەنها لەسەر «کوپ» بکەین، ئەوا ئێمە هەلی چێژ وەرگرتن لە خواردنەوەی «قاوە»کە لە دەست خۆمان دەدەین، بۆیە ئامۆژگاریتان دەکەم کە گرنگی بە کوپو فنجانەکان نەدەنو لە بری ئەوە چێژ لە «قاوە»کە وەرگرن).

لەم چیرۆکەوە فێر دەبین:

١- مرۆڤ هەر چەند دوای زانستو زانیاری بکەوێت، هێشتا لە سەرەتای ڕێگا دایەو خاڵێك نییە کە لێوەی بووەستێت، بۆ نموونە ئەو قوتابیانە هەرچەندە ساڵانێك بوو زانکۆیان تەواو کردبوو، بەڵام بە تەنها سەردانێك وانەیەکی نوێ لە مامۆستاکەیان فێر بوون.

٢- خەڵکی زۆرجار گرنگی تەنها بە ڕووکاری شتەکان دەدەنو بێ ئاگان لە ناواخنو ناوەڕۆکەکەی، وەك ئەوەی لە هەڵبژاردنی کوپەکان لە لایەن قوتابییەکان ڕوویدا.

٣- هەموو ئەو شتانەی کە لە ژیانی ڕۆژانەمان هەن، وەکو پیشەو سامانو پلە و پایە کۆمەڵایەتییەکان کە بە کوپی قاوەمان چواندن، نابێت ببنە ئامانج لە ژیان، بەڵکو هۆکارن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان، هەروەکو چۆن هەموو کوپەکان تەنها هۆکارێکن بۆ خواردنەوەی قاوە.

٤- خاڵێکی تر کە بە داخەوە زۆر لە خەڵکان پێوەی گیرۆدەن، ئەویش بریتییە لە ناسوپاسگوزاری لەسەر ئەو بەشەی کە خوای گەورە پێی داون، هەرچییەکی هەبێت بەردەوام چاودێری کەسانی تر دەکات ئاخۆ لەو باشتریان هەیە، یاخود نا! هەروەك چۆن هەر قوتابییەو سەیری دەستی ئەوی تری دەکرد ئاخۆ کامیان کوپی لەو باشتری بەرکەوتووە.



و: لە تورکییەوە: ئیمان ناصح

# دەی تۆش زەردەخەنەیەک بکە...

کچێکی بچووک پیاوێکی نامۆی خەمباری بەرچاو کەوت، بە ڕوویەکی وەک گوڵەوە زەردەخەنەیەکی بە ڕوودا کرد، پیاوەکە کە زەردەخەنەی ئەو کچە بچوکەی بینی هەستی بە باشییەک کرد لە ناخیدا، بووە هۆی ئەوەی کە هاوڕێیەکی کۆنی یاد بخاتەوە کە یارمەتییەکی دابوو، بەڵام سوپاسی نەکردبوو، هەربۆیە بە خێرایی نامەیەکی سوپاسکردنی بۆ نارد، هاوڕێکەی کە نامەکەی بە دەستگەیشت ئەوەندە هەستی بە دڵخۆشی کرد کە بەخششێکی زۆر باشی بۆ خزمەتگوزاری ئەو چێشتخانەیە بەجێ هێشت کە هەموو نیوەڕۆیەک نانی تێدا دەخوارد، خزمەتگوزارەکە یەکەم جاری بوو کە بەخششێکی لەو جۆرە وەربگرێت، زۆر خۆشحاڵ بوو پارەکەی کرد بە دوو بەشەوە، بەشێکی خستە نێو کڵاوی ئەو پیاوە هەژارەی کە هەمیشە لەسەر ڕێگاکەیدا دەیبینی.

پیاوە هەژارەکەش دوو ڕۆژ بوو تەنها پارچە نانێکیشی لە گەرووی نەچووبووە خوارەوە، بەو پارەیە خێرا چوو سکی تێر خواردن کردو بە ڕوویەکی خۆشو دڵێکی گەشەوە گەڕا تا ژوورێکی لە ژێر زەمینی باڵەخانەیەکدا بە کرێ گرت، لەو کاتەدا چاوی بە بێچووە سەگێک کەوت کە لە ژێر پاسارێکدا لە سەرماو برسێتیدا دەلەرزی، ئەویش ویستی یارمەتی بداتو بردییەوە بۆ ژوورەکەی.

بەچکە سەگەکە بەوەی کە لەو شەوە ساردەدا ڕزگاری ببوو، زۆر دڵخۆش بوو، بە نێو ژوورەکەدا هەر خەریکی ڕاکردنو گەمەکردن بوو...

لە نیوە شەودا بە هۆی کەوتنەوەی ئاگرێکەوە دووکەڵ خەریکبوو تەواوی باڵەخانەکە داگیر بکات، بێچووە سەگەکە هەستی بە کەوتنەوەی ئاگرەکە کردو دەستی کرد بە وەڕین، پیاوە هەژارەکە خێرا لە خەو ڕاپەڕیو پاشان تەواوی خەڵکی باڵەخانەکە لە دەنگەکە بە خەبەر هاتن.

لە دووهەم نهۆمدا دایکو باوکی کچێکی بچووک گوێیان لە دەنگی وەڕینی بێچووە سەگەکە بوو، خێرا بە خەبەر هاتنو ڕایان کرد بەرەو ژووری کچەکەیانو باوەشیان پێدا کردوو ڕزگاریان بوو، ئەو کچە بچووکە هەمان ئەو کچە بوو کە بەیانی ئەو ڕۆژە زەردەخەنەی بە ڕووی پیاوە خەمبارەکەدا کرد...

دەبینین هەمووان بە هۆی زەردەخەنەیەکەوە چۆن دڵیان ڕووی لە ئارامیو خۆشی کردو بووە هۆی ڕزگارکردنی چەندین گیان..

کەواتە خێرا تۆش زەردەخەنەیەک بکەو ببە بە هۆی دڵخۆشی کەسانی چواردەورت.

وشیار عەلی



# بۆ تۆ کە نەمزانی پێناسەت بکەم

بێدەنگ مەبە کە ئەزانی
بێشك بێشکەی چاوت نەبێ،
کۆرپەی دڵم ستار ناگرێ..
بێدەنگ مەبە کە ئەزانی
لایلایەی تۆ نەیمرێنێ،
کوڵی حەسرەتم نامرێ...
ئەی دایەگیان..بێدەنگی تۆ
خۆری خەندەم لێ ون دەکا..
شەپۆلی دەریای بێتۆیی،
کەشتی ڕۆح سەرو بن دەکا..
بێدەنگ مەبە،حەزم لێیە
هەردەم هەوری زارت چڕ بێ..
بەخوڕ داکا وەشتی وشەت،
تا کارێزی دڵم پڕ بێ..
خۆشم دەوێیت دایکی مەزن،
زیاتر لە خۆمو هۆنراوەم..
زیاتر لەو دڵە تاداره
بەتیغی غەم ئەنجنراوەم!!
زیاتر لەوەی لام شیرینە،
تۆ شیرینتری دایەگیان..
کوا پێناسەت بە من دەکرێت؟
ئەی جوانترین دیاری ئاسمان..

بەشی دووەم و کۆتایی

# خۆشەویستی ڕاستەقینە

درەخشان بەهادین محەممەد



دەمەوێت بڵێم: ئەی ئەوانەی تازە بە تازە زەماوەندتان کردووەو ژیانی هاوسەرێتیتان دەست پێکردووە، بۆ تاقیکردنەوەی ئەندازەی خۆشەویستیو وابەستەیی هاوسەرەکەت با ویستت، چەند ڕستەیەكو دەربڕینی دووبارەی «خۆشم دەوێت» نەبێتو چاو ببڕە ڕێگەکانی دیکەی دەربڕینی ئەڤینو خۆشەویستی.

لە ڕاستیدا بۆ هەڵسەنگاندنی خۆشەویستی ڕاستەقینەی مرۆڤەکان زۆر ڕێگە هەیە، ئێوەش لە بری بیرو زەین دانە سەر وتەو وشەو نووسراوتان، هەوڵبدەن لە ڕێی ڕەفتارو هەڵسوکەوتی کەسانی دەوروبەرتان لە ژیانی ڕۆژانەدا ئەندازەی خۆشەویستیتان هەڵبسەنگێنن.

با پێکەوە بەسەرهاتێکی دیکە بخوێنینەوە..

لە ئاوایییەکدا جوتیارێکی زەحمەتکێش هەبوو، خاوەنی خێزانو چەند کچو کوڕێك بوو. ڕۆژێك ورچێکی دڕندە، پەلاماری ئاوایییەکەی داو چەندین کەسی زامدار کردو چەند کەسێکیشی کوشت. پاش ئەو ڕووداوە، جووتیارەکە بۆ پاراستنی کێلگەو پارێزگاریکردن لە گیانی ئەندامانی خێزانەکەی، ژوورێکی لە دەرەوەی ماڵەکەیدا بۆ پاسەوانیی دروستکردو شەوانە پاسەوانیی ماڵو خێزانەکەی دەکرد، تا ئازاریان پێ نەگاتو شتێکیان بەسەر نەیەت.

دیسانەوە شەوێکیان ورچ هاتەوە نێو ئاوایییەکە، ئەمجارە جووتیارەکە لە کێلگەکەیدا بەرەنگاری بوویەوە، هەر بۆیە سەرو ڕووی بەسەختی بریندار بوو، بەڵام سەرەنجام توانی ورچەکە بکوژێت. لەبەرئەوەی جوتیارەکە زۆر بە سەختی بریندار ببوو، بۆ چارەسەرکردن ڕەوانەی شارێکی دووریان کرد، بە هۆی ئەوەی ئەو دەمە زانستی نۆژداری پێست نەبوو، بە شێوازی داخکردنو سوتاندن، زامەکانییان دەرمان کردو سەرەنجام ڕووخساری زۆر ترسناك بوو.

ڕۆژی دواتر هەواڵ هات کە پیاوە جوتیارەکە لە نەخۆشخانە هەڵاتووەو دیار نەماوە!

سەرەڕای ئەوەی هەمووان دەیانزانی کە جووتیارەکە لەبەرئەوەی نەبێت بە هۆی ئازارو شەرمەزاری بۆ منداڵەکانی، ئەو کارەی کردووەو خۆی شاردووەتەوە، دەیانگوت: شێوەی زۆر سامناك بووە، وا باشترە بە جۆرێك خۆی بشارێتەوە.

ساڵان تێپەڕی، ژنو منداڵی جووتیارەکە بە نەبوونی باوکە جوتیارەکەیان ڕاهاتبوون. ڕۆژێك لە گوندەکەدا هەواڵ بڵاوبوویەوە کە چەند ورچێك هاتوونەتە ناو ئاوایییەکەوەو پەلاماری دانیشتووانەکەیان داوە، شەوێکیان دووبارە یەکێك لە ورچەکان چوو بووە ناو کێلگەی جووتیارەکەوەو ژنو منداڵەکانی لە ترساندا دەستیان بە قاووقیژو هاتوهاوار کرد.. بەڵام پاش کەمێك دەنگی ڕووبەڕووبوونەوەی پیاوێك سەرنجی هەمووانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، ئەو پیاوە بە چەند لێدانێکی لێزانانەو حساب بۆ کراو، ورچەکەی لە ناو بردو شەڕو بەڵای ئەو ورچەی لەسەر ماڵو منداڵی جووتیارەکە لادا. ئەو پیاوە ڕووخسارێکی سووتاوو ترسناکی هەبوو، بەڵام ژنی جووتیارەکە لە یەکەم نیگادا، توانی هاوسەرە ونبووەکەی بناسێتەوە.

جووتیارەکە سەرەڕای ئەو زامو ئازارەی بەسەریدا هاتبوو، هێشتا ئازایانە پارێزگاری لە ماڵو منداڵەکەی دەکرد.

ئێستە ئێوە بڵێن.. ئایا جووتیارەکە ژنو منداڵەکانی خۆش دەویست؟ چەند؟ بۆچی؟

دووبارە با شێوەی نوێی خۆشویستن لەم بەسەرهاتەوە فێر ببین:

* خۆشەویستی ڕاستەقینە، پێویستی بە پاداشتو وەڵامدانەوەو قەرەبووکردنەوە نییەو یەکلایەنەو بێ هۆکار دەردەبڕدرێت.

* خۆشەویستی ڕاستەقینە، بە لێدانو زامو ناسۆر لە ناو ناچێت، ئەویندار تا دوا هەناسە، خۆشەویستەکەی خۆی دەپارێزێت.

* خۆشەویستیو ئەوینی ڕاستەقینە، تواناکانی مرۆڤ وەك ئازایەتیو چاونەترسیی تاك لە کارە بێ وێنەو دژوارەکاندا زۆرتر دەکات. مرۆڤی ئەویندار کاری وەها دەکات کە لە بارودۆخی ئاساییدا، لەوانەیە ئەو کارو ڕەفتارە، لەو کەسە چاوەڕێ نەکرێتو بە دوور بزانرێت.

* ئەویندارو دڵسۆز.. زۆرتر لەوەی کە نیگەرانی شێوەو سەلامەتی خۆی بێت، نیگەرانی ئارامیو سەلامەتی ئەو کەسەیە کە خۆشی دەوێت.

* ئەوینداری ڕاستەقینە.. بە هۆی ئەوینە پاکەکەیەوە، پێشوەخت هەست بە ناڕەحەتیو ئازاری خۆشەویستەکەی دەکاتو لە کاتی خۆیدا خۆی دەگەیەنێتە جێ.. هەستی پێشبینیکردنو هاوسۆزیی لە ئەوینداری ڕاستەقینەدا.. ئێجگار ناوازەیە.

* هەمیشە لە دژوارترین بارودۆخدا،

دەکرێت پشت بە شەیداو ئەوینداری ڕاستەقینە ببەسترێت.

ئەم خاڵانە هێشتا سەرەتاییترین شێوەی ناسینەوەو تاقیکردنەوەی ئەوینداری ڕاستەقینەیە... لەو کەسانەی کە بە قسەو ڕواڵەت دڵدارنو جێگەی متمانە نین.

بە ڕاستی کاتێک ئەم هەموو ڕێگایانە بۆ ناسینی دۆستو خۆشەویست هەن، ئیدی بۆچی مرۆڤەکان لە هەڵسەنگاندنی خۆشەویستی دەوروبەرەکانیان هێندە دوودڵن؟!

کاتێک کەسێکت خۆش دەوێت:

- کاتێک کەسێکت خۆش دەوێت، تەنانەت بە یادکردنیشی شادو دڵئارام دەبیت.

- کاتێک کەسێکت خۆش دەوێت: کە لە گەڵیدا ڕێ دەکەیت، هەست بەسەر بەرزیو دڵئارامیو بێ خەمیو دڵنیاییو شانازی دەکەیت.

- کاتێک کەسێکت خۆش دەوێت: شادی ئەو بۆتان، جوانترین دیمەنی دونیاو ناڕەحەتییەکانی گەورەترین خەمی دونیایە، هەر بۆیە بە شێوەیەکی خۆ نەویستانە ڕێزێکی تایبەتی لێ دەگریت.

- کاتێک کەسێکت خۆش دەوێت: خۆشترین کاتەکانی تەمەنت ئەو کاتانەیە، کە لەگەڵ ئەودا گوزەراندووتە.

- کاتێک کەسێکت خۆش دەوێت: لە بارودۆخێکدا هەستی تەنیاییو نائومێدی دەروونتی تەنیوە، هیچ ڕێگەیەک بۆ دەربازبوون شك نابەیت، بە گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەودا هەست بە هێمنایەتی دەکەیتو خەمەکانت دەڕەوێنەوە.

- کاتێک کەسێکت خۆش دەوێت: بە ویستو داخوازییەکانی ئەو زیاتر لە هیواو ئارەزووەکانی خۆت گرنگی دەدەیت.

- کاتێک کەسێکت خۆش دەوێت: وشەی تەنیایی لاتان بێ مانا دەبێت، خواستەکانت هیواو ئارەزووەکانی ئەو دەبێت.

- کاتێک کەسێکت خۆش دەوێت: بە سەرکەوتنو ناوبانگی، دڵخۆش دەبیو هەست بە سەربەرزی دەکەیت.

- کاتێک کەسێکت خۆش دەوێت: لە ناو دڵی زستانیشدا هەستێکی بەهاریت دەبێت.

- بەڕاستی خۆشەویستیو هەستی خۆشویستن، چەندە جوانو ناوازەیە، بێگومان جوانترو ناسکتر لە ئەو، ڕاستەقینەیی ئەو عەشقو هەستەیە. هەروەك نموونەی ئەو خۆشویستنە ڕاستەقینانەی لە سەرەتادا باسمان لێوەکرد.

لە کۆتاییدا ماوەتەوە بڵێین: با ڕاستیو دروستیی خۆشەویستیی دەوروبەرەکانمان لە ڕێگە جیاوازەکانەوە بخەمڵێنین. بۆ ئەم کارەش هەر کاتێك چیرۆکێکی کاریگەر دەخوێنیتەوە، یاخود دەبیستیت.. ڕاو بۆچوونی خۆت لەسەر بابەتەکەو شێوەی دەربڕینی خۆشەویستییەکە لە شوێنێکدا بنووسەرەوە، چونکە هەر یەك لەو ئەندازەو پێوانەکردنانە، دەتوانێت ببێت بە یەکێك لە شێوەکانی نواندنو هەڵسەنگاندنی خۆشەویستیو دەکرێت بخرێتە بواری جێبەجێکردنەوە.



# ئەوینی ڕاستەقینە

و: فیردەوس حەسەن

ڕۆژێك مامۆستایەك لە قوتابییەکانی خۆی پرسی: ئایا دەتوانن باسی ڕێگایەکی نوێ بکەن بۆ دەربڕینی ئەوینی ڕاستەقینە؟

هەندێك لە قوتابییەکان وتیان بە بەخشین ئەوینی خۆیان دەردەبڕن، بۆ بەرامبەرەکەیان.

هەندێکیش (پێدانی گوڵو دیاریو قسەی خۆشو دڵگیر)یان بە ڕێگای دەربڕینی ئەوینی ڕاستەقینە زانی.

هەندێکی تریش وتیان: ( پێکەوە بوون لە خۆشیو ناخۆشییەکانی ژیان)، بە ڕێگای دەربڕینی ئەوینی ڕاستەقینە دەزانن.

لەو نێوانەدا کوڕێك هەستاو پێش ئەوەی باس لە دەربڕینی ئەوینی ڕاستەقینە بکات بەو شێوەیەی کە لە دڵی خۆیدا داینـاوە، چیرۆکێکی کورتی گێڕایەوە:

ڕۆژێکیان ژنو مێردێکی گەنج کە هەردووکیان (بایۆلۆجیست) زیندەوەرناس بوون، وەك هەمیشە بۆ لێکۆڵینەوە ڕۆیشتن بۆ دارستان، کاتێك گەیشتنە سەر شاخەکە نەیانتوانی لە شوێنی خۆیان بجوڵێن، بەورێکی گەورە لە بەرامبەر ژنو مێردەکەدا وەستابوو، چاوی تێ بڕیبوون، پیاوەکە تفەنگی ڕاوشکاری پێ نەبوو، لەبەرئەوە ڕێگایەك بۆ ڕاکردن نەمابوو، ژنو مێردەکە ڕەنگیان پەڕیبوو لە بەرامبەر بەورەکەدا، جورئەتی بچوکترین جوڵەیان نەبوو، بەورەکە بە هێواشی بەرەو ڕوویان دەهات، هەر لەو کاتەدا پیاوە زیندەوەرناسەکە بە هاتوهاوار ڕای کردو ژنەکەی بە تەنیا بەجێهێشت، یەکسەر بەورەکە ڕایکرد بە دوای پیاوەکەداو دوای چەند خولەکێك هاواری پیاوە زیندەوەرناسە لاوەکە گەیشتە گوێی هاوسەرەکەی. بەورەکە ڕۆیشتو ژنەکە بە زیندوویی مایەوە، کە چیرۆکەکە گەیشتە ئەم شوێنە قوتابییەکان دەستیان کرد بە ئیدانەکردنی پیاوەکە.

بەڵام کوڕەکە پرسی: ئایا دەزانن ئەو پیاوە لە ساتەکانی کۆتایی ژیانیدا هاواری چی دەکرد؟

قوتابییەکان وایان دەزانی کە بە دڵنیاییەوە داوای لێبووردنی لە هاوسەرەکەی کردووە کە بە تەنیا بەجێی هێشتووە!

کوڕەکە وەڵامی دایەوە: نا کۆتا قسەی پیاوەکە: (ئازیزم، تۆ ئازیزترین کەسم بوویت))، تکایە باش ئاگات لە کوڕەکەمان بێتو پێی بڵێ کە باوکت هەمیشە عاشقت بوو.

لەگەڵ ئەوەی دڵۆپە فرمێسکەکان ڕووخساری کوڕەکەی بە تەواوی تەڕ کردبوو، بەردەوامبوو لە قسەکانی: هەموو زیندەوەرناسان ئەوە دەزانن کە بەور تەنها هێرش دەکاتە سەر کەسێك کە جوڵەیەك دەکات، یان ڕادەکات، باوکی من لەو ساتە ترسناکەدا بە قوربانیدان بە گیانی خۆی، گیانی دایکمی لە مردن ڕزگار کرد! ئەمە ڕاستگۆیانەترینو بێ ڕووپاماییترین ڕێگای باوکم بوو، بۆ دەربڕینی ئەوینی خۆی بۆ منو دایکم..

سەرچاوە/ سایتی/ Iranianuk.com



# قسەی ئەوەڵو ئاخر

و: ڕاز هەڵەبجەیی

بۆ یەکەمجار لە ڕووی باوکمدا وەستامو وتم: یان نێرگز، یان هیچ کەس ئەگەر نەهێڵیت لەگەڵ ئەو زەماوەند بکەم بۆ هەتا هەتایە زەماوەند لە مێشکم دەردەکەم.

باوکم بە سەرسوڕمانەوە سەیری کردمو وتی:

- قسە لە ڕووی مندا دەکەیت بێ ئەقڵی سپڵە!

(ئەو ساڵانە وا باوبوو کە حاکمی خانەوادە باوك بوو، نەیدەهێشت کوڕێکی بیستو دوو ساڵەی وەکو من بیروبۆچوونی خۆی بە باوکی بڵێت، بەڵام من وتمو گیانی خۆم کرد بە قوربانی.

- ئاخر بێبەریت دەکەم.

- قبوڵمە، بەڵام تۆ ڕێگە بدە، با لەگەڵ نێرگز زەماوەند بکەم، دوای چەند ڕۆژێك باوکم منی بردە کەنارێکەوەو وتی:

- کوڕم تۆ ئەوەندە ئەو کچەت خۆش دەوێت کە لەبەر خاتری ئەو ئامادەییت لە ڕووی مندا بووەستیت؟

منیش زۆر تەریق بوومەوەو دەستەکانیم ماچ کرد، لە کاتێکدا چاویشم پڕبوو لە فرمێسك، وتم:

بابەگیان، ئەو کچێکی زۆرباشە، دڵنیام لەوەی کە دەتوانێت بوکێکی باش بێت بۆ ئێوە، من نامەوێت قسە لە قسەی ئێوەدا بکەم، بەڵام.....

باوکم ڕووی لە من وەرگێڕاو لە کاتێکدا تەسبیحەکانی بە دەستەوە بوو، وتی:

- تۆ کوڕی گەورەی منیت، ئاواتی زۆرم بۆت هەبوو، بەڵام ئێستا کە ناتوانیت وەڵامی نەخێر بە دڵت بدەیتو واز لەو کچە بهێنیت منیش قسەیەکم نییە...

لە خۆشحاڵیدا نەمدەزانی چی بکەم، دەبارە دەستی باوکمم ماچ کردو وتم: تا تەمەنم هەبێت خزمەتت دەکەم... باوکم بە بێ ئەوەی سەیرم بکات، وتی: کەواتە بە دایکت دەڵێم ڕێوڕەسمی خوازبێنییەکە ڕێکبخات.

ماڵی نێرگزو نێرگزیش خۆی سەریان سوڕمابوو، کە چۆن توانیومە باوکم ڕازی بکەم، ئەوانەش کە ئێمەیان دەناسی باوەڕیان نەدەکرد کە من کوڕی یەکێك لە سەرمایەدارەکانی ناوچەکەبمو بچمە داوای کچێك کە باوکی فەرمانبەرێکی سادەی دەوڵەت بوو، هەرچۆنێك بێت زەماوەندەکەمان بە شکۆداری بەڕێوەچوو، منو نێرگز کە چوار ساڵ لە من منداڵتر بوو، ژیانی هاوبەشمان پێکهێنا، هەرچەندە باوکم لەم دواییەدا بە زەماوەندەکەی ئێمە ڕازی بوو، بەڵام بە باشی دەمزانی کە لە دڵەوە ڕازی نییە، ئەو زۆر بە کەمی دەهاتە ماڵی منو کەمتر هەواڵی نێرگزی دەپرسی، تا ئەوەی کە خوا یەکەم منداڵی پێ بەخشین کچێکی سپیو خڕپن، من زۆر خۆشحاڵ بووم، بەڵام نێرگز نیگەران بوو و دەیگوت: لە خانەوادەی ئێوە هیچ کەسێك کچی خۆشناوێت، بە تایبەتی باوکت کە دەڵێت دەبێت منداڵی یەکەم هەر کوڕبێت.

پێکەنیمو وتم: نیگەران مەبە بۆچوونی من گرنگەو منیش زۆر سوپاسی خوا دەکەم کە منداڵێکی ساغو سەلامەتی پێبەخشیوین.

نێرگز ڕاستی دەکرد، لەو ڕۆژەی کە ئەو کچەم هاتووەتە دنیاوە، تانەو تەشەرەکان دەستی پێکرد، باوکم دەیگوت: ئەگەر بە قسەی منت بکردایەو لەگەڵ کچێکی تردا هاوسەرگیریت بکردایە ڕۆژگارت نە دەگەیشتە ئەمڕۆ، ئەو باسی ڕۆژگاری ڕەشی منی دەکردو دڵی بۆ من دەسوتا کە وای دەزانی خوای گەورە لە جیاتی کچ بەڵایەکی گەورەی پێ داوم، قسە کردن لەگەڵ باوکم سوودی نەبوو، ئەو ساڵە وەهابوو کە عادەتی کردبوو کە قسەی ئەوەڵو ئاخر بکات، لەبەرئەوە ئیتر باش نەبوو وەڵامی بدەمەوە.

ڕۆژان هاتوو تێپەڕیو دووەم منداڵیشم لە دایکبوو، ئەویش کچ بوو، ئەمجارەیان تانەو تەشەرەکان زۆر سەختتربوو، باوکم دەی وت: بینیت کوڕم؟ دڵی باوکت شکاندو خواش تۆی بە ڕۆژی ڕەش گەیاند، بهێڵن دان بەوەدا بنێم کە وردە وردە خەریکبوو قسەکانی ئەوان کاری تێدەکردم، تا وام لێهات دەستمکرد بە ڕەفتاری ناشیرین لەگەڵ نێرگزدا.

- تۆ ئابڕوت بردووم، هەموو کەس گاڵتەم پێ دەکات.

نێرگز فرمێسکەکانی سڕی و وتی:

- یەکەم تاوانی من چییە؟ دووەمیش مەگەر تاوانێکت کردووە؟ دوو کچم بۆ بە دنیا هێناوی وەکو گوڵ وان؟

- تاوانی تـۆ ئەوەیە کە منت لە کوڕ بێ بـەش کردووە، تاوانی تـۆ ئەوەیە کە یـەك لـەدوای یەك کچت دەبێـت، تاوانی تـۆ ئەوەیـە کە بە بـێ ئەدەبـی وەڵامم دەدەیتەوە.. دیسانیش بڵێم؟

وەکـو کەسـێك کـە لەبـەر بـاران بووبێت چووە کەنارێکەوەو خۆی کزکردو چاوەکانـی داخسـت، دڵـم بۆی دەسـوتا، منداڵەکانیش دەگریان، سوپاسی خوام کرد کـە ئەوان بچوکنو لە شـەڕی نێوان منو دایکیان تێناگەن.

دوای سـێ سـاڵ نێرگز دیسـان سکی هەبوو، هەردووکمان داوامان لە خوا کردبوو کە کوڕێکی جوانمان پێ ببەخشێت، بەڵام... بەڵام بۆ جاری سێیەم دیسان هەر کچ بوو، ئەمجارە باوکم زۆر توڕەبوو وتی:

-شەرمەزار بیت کوڕە، پیاو نیت ئەگەر تەڵاقی نەدەیتو ئەم سەر شۆڕییە لە کۆڵی خـۆت نەکەیتەوە، کاتێك کـە بە نێرگزم وت کـە جگە لە جیابوونـەوە چارەیەکی ترمان نییە، وەکو بارانی بەهار فرمێسکی دەڕشتو دەپاڕایەوە کە واز لەم بۆچوونەم بهێنـم، بەڵام من مانـدوو ببووم‌و تاقەتی قسـەی خەڵکم نەمابوو، هەروەك کە وتم باوەڕم بە خـۆم نەمابوو، هەر لەبەرئەوە لەسەر قسەی خۆم سور بوومو بە نێرگزم وت: نـا، تەڵاق تەنها چارەیە، بۆئەوەی کە خەفەتیش نەخۆیت هەر سـێ منداڵەکەت پێ دەدەم.

نێرگـز وای دەزانـی کـە دەمەوێـت دڵسـۆزی لەگەڵـدا بکـەم، بـەڵام ئەمـە نەخشـەی باوکم بوو کە وتی: منداڵەکان بدە بە ئەو، تا یەکسـەر کچێکی باشت بۆ بهێنم، ئەگەر ئەم کارە نەکەیت منداڵەکان بەسـەر خۆتدا دەکەونو کەسـیش ئامادە نییە شوت پێ بکات.

کاتێك نێرگزم تەڵاقدا یەکسەر باوکم وتی: کە لەگەڵ کچی یەکێك لە سەرمایەدارەکانی ناوچەکەماندا زەماوەند بکەم.

- ئەو دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئابڕووە لە دەستچووەکەت بەدەست بێنیتەوە.

زەماوەندی منو شەهلا لە کاتێکدا بوو کە دوراودوور دەمبیست نێرگزو منداڵەکانی ڕۆژگارێکی باشـیان نییەو باروگوزەرانی ژیانیان زۆر ناخۆشـە، منیـش چەند بێ بەزەیی بووم، مەرجەکەی شـەهلام قبوڵ کرد.

- هەرگیز نابێت نزیکی ژنە کۆنەکەتو منداڵەکانت بکەویـت، وابزانە ئەوانت لە ڕووداوێکدا لە دەسـت داون، ئەگەر نا، نە مـنو نە تۆ، جـاری وا هەبوو ئەوەندە بۆ منداڵەکانم دڵـم تەنگ دەبوو کە بە دزی ئەوانی ترەوە دەسـتم دەکـرد بە گریان، بەڵام دەمزانی شەهلا زۆر ئاگاداریم دەکاتو ئەگەر سـەردانیان بکەمو بیبێسـتێتەوە، ئەو هەموو شتێك تێکدەدات، دوای ساڵێك ئەو سـکی پڕبوو، بووینە خاوەنی کوڕێك، باوکم بە خۆشحاڵییەوە وتی: بینیت کوڕم؟ ئێسـتا ئیتـر خەیاڵم ئاسـودەیە کە ئەم خانەوادەیە بە بەردەوامـی دەمێنێتەوەو ناوم بە زیندویی دەمێنێتەوە، ئێستا ئیتر دەتوانـم بە خەیاڵـی ئاسـودەوە هەموو موڵكو سامانەکەم بکەم بە ناوی تۆوە، ئەو کارەشی کردو هەموو شتەکانی کرد بە ناوی منـەوە، بارودۆخی ژیانمان زۆر باش بوو، منیش بوومە یەکێك لە سەرمایەدارەکانی شـارەکەمان، بـەڵام دەوڵەمەندێکـی بـێ بڕیـار، چونکە تا دوێنێ قسـەی ئەوەڵو ئاخر هـەر باوکم دەیکرد، منیش دەبوایە یەکسەر قسەکەی ئەوم جێبەجێ بکردایە، منیشو شـەهلاش نەمان دەوێرا قسـە لە قسەیدا بکەین.

من نوقمی خۆشـیو نیعمـەت ببووم، بـەڵام بیرم لە منداڵەکانـم نە دەکردەوە، ئەوەنـدە بێئـاگا بـووم، وام دەزانی دنیا هەر ئـاوا بـۆ مـن دەمێنێتـەوە، باوکم کۆچـی دوایی کـردو ئەوەی کـە لە ئەو بەجێ مابوو بە من گەیشـتو بارودۆخم ئەوەندەی تر باشـتر بوو.. ئێستا خاوەنی کچێکیش بووم. ڕۆژێکیان لە نووسـینگەی کارەکەم دانیشـتبووم، نێرگـز هات بۆلام، مـن ئەوم جار جار دەبینی، بەڵام هەرگیز پێشتر نەهاتبوو بۆ لام، بۆیە بە لەخۆبایی بوونێکەوە وتم: چی ڕوویداوە وا هاتوویت بۆلام؟

وتی: نزیکەی بیست ساڵە بە نەداریو هـەژاری منداڵەکانـم بەخێـو کـردووە، تەنانەت یەك جاریش دەسـتم لە تۆ پان نەکردووەتەوە، بەڵام ئەمجارە بارودۆخەکە جیاوازە.

کچە گەورەکەمان دەیەوێت شو بکاتو داواکاری باشیشـی هەیـە... ویسـتم بڵێم ڕێوڕەسـمی زەماوەندەکـەی... نەمهێشـت قسـەکەی تەواو بکات، وتـم: ناتوانم، من پەیمانم بە شەهلا داوە ئەگەر بێم ژیانمان تێکدەچێت، بڕواش ناکەم مەسەلەکە ئەمە بێت، وا بزانـم کچەکەمان دەیەوێت بێمو دیارییەکی ئابڕومەندانەی پێشکەش بکەم. پەشیمان بووم کە بۆچی ئەم قسەیەم کرد، هەرچـی بوو خۆ ئەو کچم بوو، بەڵام خۆ نەمدەتوانی قسـەیەك کە کردوومە وەری بگرمـەوە. نێرگز سـەیرێکی کـردمو لە کاتێکدا کە بەرەو لای دەرگاکە دەڕۆیشـت وتی:

- تەنهـا یـەك پرسـیارم لێـت هەیە، ئەگەر چی نە بۆنی خۆشەویستیو نە بۆنی مرۆڤایەتیـت لێ دێت... بڵێ بزانم شـەهلا چ شـتێکی گرنگـی هەیە کـە منداڵەکانت بەو فرۆشـتو تـەواوی ئەم سـاڵانە ئامادە نەبوویـت تەنها بۆ جارێکیش سـەریان لێ بدەیت؟

- ئەو کوڕی بۆ هێناوم، کوڕو ئابڕو... کوڕو سەربەرزی...

نێرگز لە نووسینگەکەم چووە دەرەوەو دوایـی وەکو شـتێك بیـری کەوتبێتەوە وتی:

- کەواتە بە باشـی پەروەردەی بکەو بڕۆ بزانە چ قسـەیەك لە پشت سەرییەوە دەکەن.

نێرگـز کەسـێك نەبـوو کـە هـەر لەخۆیەوە قسـە بـکات، لەبەرئـەوە ئەو قسەیەی جەسـتەی هێنامە لەرزین، شەو کە ڕۆیشتمە ماڵەوە بە شەهلام وت:

- ئاگات لە (شاروخ)ە؟ نەکا لێی بێئاگا بیت؟

- بۆچی؟ چی بووە؟

- شتێك نەبووە، بەڵام دەبێت بزانیت خەریکی چییەو هاوڕێکانی کێنو چۆنن؟

شەهلا وتی:

- وانازانـم کوڕێکـی حەڤـدە سـاڵە پێویسـتی بەوە هەبێت کە کەسێك بەسەر سەریەوە بێت، دوای چەند ڕۆژێك قسەکەی نێرگـزم بیرچووەوە، دوای چەند سـاڵێك ڕوداوێك کە نە دەبوو ڕووبدات، ڕوویدا.

(شـاروخ) لـە تەمەنی بیسـتو یەك سـاڵیدا بە تاوانی پیاو کوشـتن دەستگیر کـرا. باوەڕ کردنی ئەم هەواڵە بۆ من زۆر سـەخت بوو، بەڵام ئەمە ڕاستی بوو، ئەو لەسـەر شـتێکی بێ مانا، هاوڕێکەی خۆی بە چەقۆ کوشـتبوو. منیشو سامانەکەشم هیچ شتێکمان لە دەست نەدەهات، دادگاش بڕیـاری لە سـێدارەدانی ئـەوی دەرکرد، چەندین جـار چوومە ماڵـی کوژراوەکە، بەڵام ڕازی نەبوون.

لە ڕۆژێکی ساردی زستانیدا (شاروخ)یان لە بەرچاوم لە سێدارەدا.

لەوانەیـە ئەمە مافی ئەو سـتەمانە بووبێت کە من بەرامبەر بە نێرگزو سـێ کچەکەم کردبووم.

سەرچاوە/ روزهای زندگی



گوڵان حەمە ئەمین

# بزانە لە کام جۆری مرۆڤیت؟

لە نزیکترین مەوداوە، کە ناخی خۆمانە تا دوورترین کە کۆمەڵگاکانو شارستانیەتە جۆربەجۆرەکانە، گەر بمانەوێت مرۆڤەکان پۆلێن بکەین بۆ چەند جۆرێك، ئەوە نزیکە کە بڵێین لە هەمووچاخە جیاجیاکاندا، جۆرەکانی مرۆڤ لە ڕووی مامەڵەو هەڵسوکەوتەوە بەرامبەر خودی خۆی پاشان دەوروبەری دەبنە سێ گرۆو تاقمی جیا، ئەمەش لەبەرئەوەی مرۆڤ هەر مرۆڤە، کەواتە خوێنەری ئازیز هاوڕێم بە لە خوێندنەوەی ئەم بابەتەدا سەرنج بدەو بزانە سەرجەمی ئەو کەسانەی تۆ مامەڵەت لەگەڵدا کردوون، ئەوانەی کە مێژووی ژیانیانت خوێندووەتەوە، ئەوانەی لە نیزیکتدا دەژین، هەروەها خودی خۆت، بزانە لەم سێ جۆرە تێپەڕناکەن، پاشان بزانە لە کام جۆری؟ هەوڵبدە گەر لە جۆری یەکەم نیت، ئەوە لە ئێستا بەدواوە هەموو توانایەکی خۆت بخەرە کار تا لە جۆری یەکەم بیت، تاجوانی ڕەوشتو خۆشەویستی ناخت، لە دڵی ئەوانی دیدا بچەسپێتو جێدەستت لە سەر شانۆی ژیان بنەخشێتو ناوت لە نێو لاپەڕەکانی نەمریدا تۆمار ببێت

## جۆرەکانی مرۆڤ

١- فریشتە ئاسا: واتە وێنەی فریشتە لە پاکیو بێگەردیدا، ئەم جۆرە کەسانێکی دەستوداوێنو زوبان پاکن، ڕەوشتبەرزو مامەڵەجوانو دوور لە هەموو ڕقو کینو ئیرەییو خۆبەگەورەزانینو...هتد، لە نێوان پاکی ڕۆحو جەستەو دەروونو رووخسارو پۆشاك... بە وێنەی دورومرواری ناوصەدەف وان، چاکەیان بۆ هەمووان دەوێت، خۆشیو شادی هەمووان ئاوێتەی ئاواتەکانیانە، هەمیشە دەستێکی سپییە بۆ هەژارانو نەدارانو دڵێکی میهرەبانە بۆ بێ نازان، خاوەنی زوبانێکی شیرینن، لە هەر کوێ بن، ئەو شوێنە ڕووناك دەکەنەوە، بە پرشنگی ڕەوشتی جوانو سەنگینیان، هەر لەبەر ئەمەشە ئەم جۆرە مرۆڤانە هەمیشە هەست بە ئاسودەیی دەکەن، ڕۆحیان گەشاوەیەو شادی بەخشن، یەکەم سودمەند ناخی خۆیانە، پاشان خێزانو کۆمەڵگا، گەر بێتو هەموو تاکەکان بەمجۆرە بن، هەموو خێزانەکانیش لە لوتکەی بەختەوەریو جوانیو گەشاوەییدا ئارامی بە کۆمەڵگادا پەخش دەکەن، گەر خێزانەکانیش هەموو بەمجۆرە بن ئەوا کۆمەڵگایەکی ئارامو ئاسودەو دوور لە ترسو نیگەرانیو ناخۆشیو بێ ئومێدی... بەرهەم دێت!

٢- ئاژەڵئاسا: ئەمجۆرە مرۆڤانە بێ ئامانجو بێ ئومێدو بێ پرۆژەن... تەنها دەزانن بخۆنو بخۆنەوە، خزمەت بە لایەنی جەستەیی خۆیان بکەنو لایەنی ژیریو ڕۆحییان فەرامۆش کردووە، تەنها بە دوای تێرکردنی غەریزەکانیاندانو لەم پێناوەشدا بەها باڵاکانو ڕەوشتەبەرزەکان دەشکێننو مافی هەمووان پێشێل دەکەنو چاوی تەماحیان کەوتە سەر هەرشتێك کە ئارەزووی بکەن ئەوا کۆتو بەندی ڕەوشت دەشکێننو بە دەستی دەهێنن، ئەمجۆرە کەسانەش بەڵای نێو خێزانەکانو ئەو خێزانانەش کە ئەم شێوە مرۆڤەیان تێدایە دەبنە خۆرەی کۆمەڵگا، هەمیشە ناخێکی دژوارو ئاڵۆزو دوور لە ئاسودەییان هەیە.

٣- شەیتان ئاسا: ئەمجۆرە مرۆڤە خاوەنی دەروونێکی ئاڵۆزی پڕ لە شەڕەنگێزیو دوور لە هەموو سۆزو بەزەییو خۆشییەك، تێکشکێنەری خۆشیو شادیو لە ناوبەری خەندەو هۆکاری ئاڵۆزیو پەشێوی نێو خێزانو کۆمەڵگاکانن، لێرەوە دەزانین سەرجەمی نەهامەتیو کارەساتە دژوارەکان کە بەسەر مرۆڤایەتیدا دێت بەرهەمی ئاڵوتفتی ئەم جۆرە مرۆڤانەیە، تەسکترینی سنوری دەسەڵاتی ئەم مرۆڤانە باسکردنو ناوزڕاندنی خەڵکو ئیرەییو حەسادەت بردن بە کەسانی دیو حەز نەکردن بە خۆشیو سەرکەوتنیانو قسە هێنانو بردن لە نێو هاوڕێو دۆستاندا، لە فراوانی دەسەڵاتیشیاندا لە ناوبردنی کۆمەڵگاو ڕەشەکوژی دەمکوتکردنی خەڵك لە ئاست داواکردنی مافەکانیاندا، ئەمجۆرە مرۆڤانە گەر زانستیشیان هەبێت لە پێناو لە ناوبردنی مرۆڤایەتیو گەندەڵیو پلانی سیاسیو خاپورکردنی شارستانییەتدا بەکاری دەهێنن، یەکەم زیان لێکەوتووش خودی خۆیانن کە دەبنە مێژوویەکی ڕەشی پڕ لە نەگبەتیو نەهامەتی.

ئازیزان ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەوەیە بزانین ئێمە لە چ جۆرێکین، گەر لە جۆری یەکەمین ئەوا ئەوەی گرنگە بتوانین پارێزگاری لێ بکەینو بەردەوام بین لە سەرچاکیو پاکیو ببینە سیمایەکی جوانو نموونەیەکی قەشەنگی مرۆڤایەتی بین، گەر کۆمەڵێك، یاخود زۆرێك لە ئاکارو ڕەوشتەکانمان لە دوو جۆری مرۆڤە ناپەسەندەکانە، ئەوە زۆر گرنگە کە چیدی هەوڵبدەین خۆمان بە دووربگرین لەو ناپەسەندییە، خۆمان نوورانیو ڕازاوە بکەین بە ڕەوشتی بەرزو بەهای بەرزو باڵاکانو بچینە بەرزترین ئاست، بە دڵنیاییەوە ئەوەش کە لە دەوروبەر بەدی دەکەین لە ڕەوشتە نەشیاوەکان ئەمەش هەر ئەرکی مرۆڤە ژیرو داناو لێهاتووەکانە کە هەڵەکان ڕاست بکەنەوەو دەستی سپیو پرشنگی ڕەوشتیان شەرو نەهامەتی دەروونە شێواوەکانیش برەوێننەوە، دەبێت ئەو نوورە هێندە بە تینو تاو بێت تا دەگاتە تروپی دڵە تاریکەکانو ڕۆشنیان دەکاتەوە، بەمەش دەبینە نموونەیەکی بەرزو نەمر لە دڵی خەڵکو لاپەڕەکانی مێژوودا.



# خەم و پەژارە... هۆکار... دەرئەنجام... چارەسەر...

وەرزێر عەبدوڵڵا

سروشتی ژیانی کۆمەڵگە پێکهاتووە لە کۆمەڵێك گروپو لایەنی جیاواز، خودی ژیان زنجیرەیەکە لە تاقیکردنەوە. کۆمەڵێك بەرزیو نزمی، خۆشیو ناخۆشی، هەربۆیە لەم سەردەمی جیهانگیریو جەنجاڵییەدا خەمو پەژارە دووچاری زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵگە بووەو بووەتە بەشێك لە ژیانی مرۆڤایەتی، بەڵام لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی دی، لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر جیاواز، لەبەرئەوە لێرەدا کۆمەڵێك هۆکار دەخەینە روو کە دەروازەن بۆ خەموپەژارە:

١- خەفەت بۆ رابردوو، ئەگەر وام بکردایە، وام بگوتایە، ...هتد.

٢- دڵتەنگی لە ئێستادا، لە ژیانی رۆژانەیدا زۆر چاودێری خەڵکی دەکات، بۆ خەڵکی دەژی، بەراووردی خۆی لەگەڵ خەڵکی سەروو خۆی دەکات.

٣- ترس لە ئایندە، زیاتر لە داهاتوودا دەژی وەك لە ئێستادا.

٤- هەستی ناتەواوی، لە خۆی نارازییەو خۆی بەکەم دەزانێت.

٥- هۆکاری رامیاری نادادپەروەریی لە سیستەمی ژیاندا، واتە هەلو دەرفەتی کار بۆ هەمووان یەکسان نییە.

٦- هۆکاری مادی، نەبوونی پێداویستییەکانی ژیان.

٧- هۆکاری سروشتی، وەك مردنو نەخۆشیو... هتد.

٨- هۆکاری مرۆیی، خراپی مامەڵەی دەوروبەر.

٩- بەتاڵی فکریو جەستەیی، کە خراپترین کارەساتی سەردەمە.

١٠- فەراغی رۆحیو لاوازی بیروباوەڕ، دووری لە بەرنامەو پەیامی ئیسلام.

١١- هاوڕێی رەشبین کە هەمیشە خەم دابەش دەکات.

١٢- کاریگەری راگەیاندن، مەبەست خراپ بەکارهێنانیو پیشاندانی کارەساتو دیمەنی دڵتەزێن، بە تایبەت راگەیاندنو هەواڵی عێراقی.

١٣- تەنهاییو گۆشەگیریو بیرکردنەوە لە تۆڵە.

دەرئەنجام:

١- هەموو ئەو هۆکارانەی باسکران، لە رووی تەندورستییەوە کاریگەری هەیە لەسەر جەستە، مرۆڤ تووشی نەخۆشی کۆلۆنو شەکرەو... هتد، دەکات، تەنانەت زانستی ئەمرۆ ئەوەی سەلماندووە ئەو جگەرەیەی لەکاتی ناخۆشیدا دەیکێشێت زیانی زیاترە، وەك لە کاتی ئاسایی.

٢- لە رووی کۆمەڵایەتییەوە کاریگەری هەیە لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی، وا لە مرۆڤ دەکات بەرامبەر بە خێزانو منداڵو دەوروبەر خراپ بێت.

٣- لە رووی ئاینییەوە متمانەو باوەڕی مرۆڤ لاواز دەکات، چونکە مرۆڤ تەنها کێشەو گرفتی خۆی دەبینێتو دەبێتە مرۆڤێکی بێ ئامانج لە ژیاندا.

٤- لە رووی دەروونییەوە وا لە مرۆڤ دەکات فکری بە شتی خراپەوە سەرقاڵ بێت، لە هەمووشتێك دەترسێت، هەمیشە دوودڵو نیگەرانەو توانای بڕیاردانی نابێت.

چارەسەر:

١- ئەو رووداوانەی کە لەدەرەوەی توانای تۆدایە، بیبەرە دەرەوە.

٢- هەمیشە سەیری خوار خۆت بکە، وەها بیر بکەرەوە کە هەموو پێداویستییەکانت بە قۆناغ دەست دەکەوێت.

٣- لە ناخەوە هەست بەوە بکە خودایەك هەیە، هەمیشە پشتیوانتەو ئاگاداری نارەحەتیو دەردەسەرییەکانتە.

٤- هەموو خۆشییەکانت لەیەك شتدا کۆمەکەرەوە، مەیبەستەرەوە بە مادە، بە هاوسەر، واتە: هەموو بیروبۆچوونو دڵت تەرخان مەکە بۆ یەك شت.

٥- ئارام بگرەو خۆراگربە، چونکە ئەگەر تووشی نارەحەتی نەبین، هەست بە خۆشییەکان ناکەین، هەر وەك چۆن ماسی لە ئاودا هەست بە بوونی ئاو ناکات، تاوەکو نەیەتە دەرەوەی ئاو.

٦- سوپاسی خودا بکە کە بە مرۆڤێکی تەندروستو لەشساغو ژیر دروستی کردوویت.

٧- باش بزانە نارەحەتی تووشی زۆرێك لە خەڵکی دەبێت، تەنانەت پەیامبەرانو زانایانو چاکەکاران، لە پێش ئێمەدا توش بوون.

٨- بەرەو خودا چوون، ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە کە خەمو پەژارە لە ناوبەرێت، باش بزانە کە بۆ تاقیکردنەوە دورستکراوین، مەرج نییە هەموو شت بە دڵی تۆ بێت.

٩- گەشتکردنو خوێندنەوە لە کاتی نارەحەتیدا.

# وەفایەکی درەنگ

شێخانی



بەداخەوە مرۆڤ زۆرجار زۆر شتی بە نرخی هەن کە بە هەموو زێڕوزیوو گەنجینەی دونیا بەراورد ناکرێن، بەڵام ئەو کاتە بەهایان دەزانێت کە لە دەستی چوون!

یەکێک لە بەنرخترین ئەو شتانە ئەو کەسانەن کە لە دەوروبەرمانن و شوێنەواری زۆر کاریگەریان لەسەر مەساری ژیان و ئاراستەی زانستیمان بەجێهێشتووە.

ئەو مامۆستا بەڕێزانەی لەسەر دەستی ئەوان زمانمان بە (ئەلف و بێ) پژاوەو بۆ یەکەمجار لە ژیانماندا توانیمان دارا، دوو داری دی، بخوێنینەوەو چۆلەکەی سەر دارتووەکەمان و سێوی قەد دارسێوەکانی پێ بژمێرین، فەزڵێکی زۆر گەورەیان لەسەرمانەو تا مردن قەرزاری ئەوانین.

ئەمڕۆش ئەگەر بە هەر پلەیەکی زانستی و هەر ئاوات و ئامانجێکی بەرز گەیشتبین، ئەوا بەرهەمی پەروەردەو هەوڵدانی ئەو مامۆستا بەڕێزانەیە.

ئەوان دەستی بچکۆلەیان گرتین و ئارامی و دڵنیاییان پێ بەخشین، بە خوێندن و نووسین ئاشنایان کردین و زانست و خوێندەوارییان لە لا شیرین کردین.

یەکێک لەو مامۆستایانەی کە گەلێک سوودمەندبووم لێی و بەردی بناغەی فێربوونی ڕێزمانی عەرەبیم لەسەر دەستی ئەو دانا مامۆستا (محەمەد ئەمینی ئاغجەلەری) بوو.

لە پۆلی چوارەمی سەرەتاییەوە لەلای ئەو مامۆستا بەڕێزە (شەرحی ئاجرومیەم) خوێند و دواتر بە پلیکانەی کتێبەکانی (نحو، صرف)ی عەرەبیدا سەرکەوتم و تا ئەمڕۆش دەنگی بڵندی ئەو ئوستازە بەڕێزەم لە گوێدا دەزرنگێتەوەو نوکتەو قسە خۆشەکانیم لە یادە.

دواجار پێش حەوت ساڵ لە سەفەری حەجدا لە شاری مەدینەی مونەوەرە چاوم پێکەوت و یادگاریی ڕۆژانی منداڵی هێنامەوە یاد.

بە هۆی دوورکەوتنەوەی منەوە لە کوردستان و سەرقاڵبوونم، بە خوێندنەوە، دوای گەڕانەوەم تەواو لەو مامۆستایەم بێ ئاگا بووم!

پێش چەند ڕۆژێک لەگەڵ جەنابی باوکمدا، بە تاسەوە بە ڕێکەوتین بۆ حزورو دیداری ئەو ئوستازە ئازیزە، کوچە بە کوچەو کۆڵان بە کۆڵان گەڕاین.

وەختێك ماڵەکەیمان دۆزییەوە، پێیان گوتین ئەو مامۆستایەی کە ئێوە هاتوون بۆ سەردانی ساڵێك زیاترە کۆچی دوایی کردووەو ئەم دنیا فانیەی بەجێهێشتووە!

بیستنی ئەو هەواڵە زۆر نارەحەتی کردم، خۆم بە تاوانبار زانی بەرامبەر ئەو مامۆستا بەڕێزەم، خۆم وەکو ئەو منداڵانە هاتە پێش چاو کە کاتێك گەورە دەبن، باوك و دایکی خۆیان بیر دەچێت.

ئەو کات زانیم وەفاکەم زۆر درەنگ وەخت بوو!!

بەڵام پەیمانم دا کە لەو ڕۆ بەدواوە، یادو وەفاداریم بۆ هەموو ئەو کەسانەی مافیان بەسەرمەوەیە دوانەخەم بۆ دوای کۆچی دواییان و بە پێی بەرنامەیەك هەموویان بەسەر بکەمەوە، بەڵکو بتوانم هیچ نەبێت بەشێك لە وەفا ئەدا بکەم.